

شرح

# ﴿ عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ ﴾

## أصْلُ السُّنَّةِ، واعْتِقَادُ الدِّينِ

ـ بە كوردی ـ

{ أبي حاتم الرازي (ت ٢٧٧ هـ) و ابي زرعة الرازي (ت ٢٦٤ هـ) رحمهما الله }

ينقلها الإمام ابن أبي حاتم الرازي (ت ٣٢٧ هـ) رحمه الله



٢٠٢١ ز – ١٤٤٣ ك

**ناوی کتێب: ﴿ عَقِيدَةُ الرَّازِيَّيْنِ ﴾**

ئامادەکردنی: بڕوا ايوب الكردي

پێداچوونەوە: م. هەندرێن خۆشناو

پێداچوونەوەی وەشانی دووەم: م. هاوكار جواد الكردي الحنبلي

ژمارەی لاپەڕە: ٢٨٧

زمان: کوردی

# وەشانی دووەم

لە وەشانی یەکەمدا چەند هەڵەیەك هەبوو لە شەرحەکەدا، بەپێی توانا لەم وەشانە نوێیەدا هەڵەکانمان چاك کردووە و چەند شەرحێکیشمان بۆ بابەتەکان زیاد کردووە ..

داواکارین لە الله تعالی لێمان خۆشبێت و لە هەڵە و کەموکورِیمان ببورێت ..

هەر هەڵەیەك هەبێت هی ئێمەیە و دینی الله پاك و بێ هەڵەیە .

## پێشەکی:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

إن الحمد لله، نحمده ونستعينهُ ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسِنا وَسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يُضلِل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله بعث بالسيف رحمة للعالمين أما بعد ...

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی لە ابو هرەیرەوە (الله لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی: ((بدأ الإسلام غريباً وسيعود غريباً كما بدأ فطوبى للغرباء)) ،

جا مەبەست لە (الغرباء): کەسانی مولتەزیم و موستەقیمە، وە (فطوبى للغرباء) واتە: بەهەشت و خۆش گوزەرانی بۆ غەریبەکان ئەوانەی کە چاکە دەکەن لەکاتی خراپ بوونی خەڵکدا، کاتێ خەڵك تێك چوون و شتەکان ناڕوون بوون و کەسی چاك کەم بووەوە ئەوان جێگیر و دامەزراو دەبن لەسەر حەق و بەردەوام دەبن لەسەر دینی الله، وە الله بە تاك ڕادەگرن و بە تەنها عیبادەت بۆ ئەو دەکەن، نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و هەموو بابەتەکانی دین بەجوانی جێبەجێ دەکەن ئا

ئەوانە غەریبن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە الله تعالی دەربارەیان فەرموویەتی: ( إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ * نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنْفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ) [فصلت: ٣٠-٣١] .

واتە : ئەو کەسانەی کە دەڵێن: خودای ئێمە (اللَّهُ)یە و پاشان جێگیر دەبن، فریشتەکان لە کاتی سەرەمەرگدا دادەبەزنە سەریان پێیان دەڵێن: مەترسن و غەم بار مەبن و مژدەی ئەو بەهەشتەتان لێبێت کە وەعدتان پێ دراوە ⁕ ئێمە یاریدەدەر و هاوکاری ئێوەین لە ژیانی دونیادا، وە هەروەها لە دوارۆژیشدا و لەو بەهەشتەدا هەموو شتێکی تێدایە کە حەزی لێ دەکەن و هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە داوای دەکەن .

جا سەرەتا ئیسلام لە مەککە بە کەمی دەستی پێ کرد، کەمێك نەبێت باوەڕیان پێ نەهێنا و زۆربەیان دژایەتیان کرد، وە هەروەها دژایەتی پێغەمبەریان کرد ﷺ و ئەزیەتی خۆی و هاوەڵانیان دەدا ئەوانەی کە موسوڵمان بوو بوون، پاشان کۆچی کرد بۆ مەدینە و پۆلێك لە هاوەڵانیش لەگەڵی کۆچیان کرد ئەوانەی کە زوو موسوڵمان بوو بوون، لە مەدینەش بەهەمان شێوە غەریب بوو تاوەکو زۆر بوون و لە هەموو جێگەکان بڵاو بوونەوە لە دێ و شارەکاندا، پاشان خەڵك پۆل

پۆل دەهاتنە نێو ئیسلامەوە دوای ئەوەی کە الله تعالی مەککەی ڕزگار کرد و کەوتە دەستی موسوڵمانان.

سەرەتا ئیسلام غەریب بوو لەنێو خەڵکدا وە زۆربەی خەڵك بێباوەڕ بوون بە الله و هاوبەشیان بڕیار دەدا و عیبادەتیان بۆ بت و پێغەمبەران و پیاوچاکان و دار و بەرد دەکرد، پاشان الله لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان هیدایەتی دان، خەڵك پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئیسلامەوە وازیان لە عیبادەت کردن هێنا بۆ بت و پێغەمبەران و پیاوچاکان و دار و بەرد، بەندایەتیان بۆ جگە لە الله نەدەکرد و لە کەس نەدەپاڕانەوە جگە لە الله و داوای یارمەتی و فریاکەوتنیان تەنها لە الله دەکرد، وە هەروەها داوایان لە قەبر و دار و بەرد و جن ... هتد نەدەکرد، ئا ئەوانە غەریبن، وە بەهەمان شێوەش لە ئاخر زەماندا غەریبەکان بریتین لەوانەی کە دەست دەگرن بەدینی الله وە، لەکاتێکدا خەڵك پشت دەکەنە دینی الله، وە هەروەها لەکاتێکدا خەڵك بێباوەڕ دەبن وە هەروەها لەکاتێکدا تاوان و خراپەکاری زۆر دەبێت، ئا ئەو غەریبانە جێگیر دەبن لەسەر دینی الله و گوێڕایەڵی الله، بێگومان ئەوانە بەهەشتیان بۆ ئامادەکراوە و خۆش گوزەران دەبن لە دونیا و دوارۆژدا.

هەروەکو دەیبینین لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئیسلام غەریب بۆتەوە و زۆربەی خەڵکی بەناو وڵاتە ئیسلامییەکان و خەڵکی کوردستان بەتایبەتی ڕوویان کردۆتە شەخس پەرستی و حزب پەرستی و پەڕۆ

پەرستی و هەواو هەوەس پەرستی و ... هتد. جا ئەمە حاڵی زۆربەی خەڵکییە و خەڵکی پشتیان کردۆتە دینی الله، وە دەستگرتن بە دینەوە بۆ موسڵمانان وەکو پشکۆیەك ئاگری لێ هاتووە.

جا سەربەرزی و سەرفرازی بۆ ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێڕەوی ڕاستی دینی ئیسلام دەڕۆن و ئەملا و ئەولا ناکەن و خۆیان لە هەموو گرووپێك و فرقەیەکی گومڕا لادەدەن. چونکە هەر کەس لەسەر ڕێگای پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) نەبێت ئەوا بێگومان لە تیاچوانە و شوێنی ئاگرە تا هەتایە ...

هەروەکو رسول الله (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: ((افترقت اليهود على إحدى وسبعين فرقة، وافترقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة، وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، قيل: من هي يا رسول الله؟ قال: من كان على مثل ما أنا عليه وأصحابي. وفي بعض الروايات: هي الجماعة)). رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه والحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم.

جا بۆ ئەوەی موسڵمانان دین و ئیمانەکەیان سەلامەت بێت پێویستە دەست بگرن بەم ڕێبازەی کە رسول الله (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی و تابعين و اتباعی تابعين و سەلەف لەسەری بوون.

جا لەبەر ئەوەی سەردەمەکەمان سەردەمێکی پڕ لە فیتنەیە و زۆربەی خەڵکی دوورن لە مەنهەجی سەلەف ، وە زۆربەی خەڵکی وڵاتانی ئیسلامی حەقیقییان لێ ون بووە، وە کەسانێك هەن ناویان لەخۆ ناوە سەلەفی و دووریشن لە مەنهەج و عەقیدەی سەلەف و خەریکی گومڕاکردنی خەڵکن لەژێر ناوی سەلەف، بۆیە ئێمەش هەستاین بە شەرح کردن و ئامادەکردنی ئەم کتێبە تاوەکو مەنهەجی سەلەف بخەینە ڕوو و خەڵکیش ئاشنابن بە عەقیدەی سەلەف و نزیك ببنەوە لە مەنهەجی ڕاستەقینەی دینی ئیسلام ئەو مەنهەجەی رسول الله (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی. الحمدلله کە الله تعالى هێز و تونای پێداین تاکو بتوانین شەرحی متن (عقيدة الرازيين) بکەین کە مەنهەجی سەلەف دەخاتە ڕوو و دەرگایەکە بۆ ئەوەی بزانین عەقیدەی ئەهلی سوننە چۆن بووە. ئەگەرچی شەرحەکە زۆر کورتە و (متن) ـەکان قسە و شەرحی زیاتر هەڵدەگرێت، بەڵام هەوڵمان داوە بە کورتی بەڵگەکان دانێین لەژێر (متن) ـەکان، وە بەڵگەی زیاتر هەیە بەڵام ئێمە بە کورتی و چەند بەڵگەیەکمان داناوە تاوەکو ببێتە بەرچاو ڕوونیەك بۆ موسڵمانان و تێگەیشتن لە متن ـەکان.

داواکارین لە الله تعالى لە هەڵە و کەموکوڕیمان ببورێت و ثابتمان بکات لەسەر دینەکەی و نیەتمان خالص بکات و دەڵێین: { اللهم يا مقلب القلوب ثبت قلبي على دينك }.

قال الإمام ابو محمد عبدالرحمن بن أبي حاتم : سألت أبي وأبا زرعة عن مذاهب أهل السنة في أصول الدين، وما أدركا عليه العلماء في جميع الأمصار، وما يعتقدان من ذالك؟ فقالا : أدركنا العلماء في جميع الأمصار حجازا وعراقا ومصرا وشاما ويمنا، فكان من مذهبهم أن:

إمامی عبدالرحمن بن أبي حاتم فەرموویەتی : پرسیارم کرد لە باوکم و أبي زرعة لەبارەی مەزهەبەکانی أهلی السنة لە بنچینەکانی دین، وە ئەوەی ئەو دوو زانایە پێی گەیشتوون لە زانایانی هەموو وڵات و شوێنەکان، وە بیروباوەڕیان چی بووە لەبارەیەوە ؟
فەرموویان : گەیشتین بە زانایان لە هەموو وڵاتەکان لە حجاز و عیراق و مصر و شام و یەمەن، بیروباوەڕیان بریتیبوو لە:

## * الإيمان قول وعمل، يزيد وينقص *

ئیمان وته و کرداره، زیاد و کەم دەکات.

**ئیمان:** لای ئەهلی سوننە و جەماعە بریتییە لە قول القلب و اللسان و عمل القلب و الجوارح ، یزید بالطاعة و ینقص بالمعصیة.

واتا ئیمان بریتییە لە قسەی دڵ و کردەوەی دڵ و قسەی زمان و کردەوەی ئەندامەکان ، وە ئیمان بە فەرمانبەری زیاد دەکات و بە سەرپێچی کەم دەکات.

### ئەوەش چوار شت لەخۆ دەگرێت:

١- قسەی دڵ ( قول القلب ) : واتا ئینسان بە عەقڵ و دڵ ( الله ) و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئیسلام بەڕاست بزانێت و هەرچی الله بۆ پێغەمبەری ناردووە بەڕاستی بزانێت و هەرچی ئیسلام داخوازی دەکات بەڕاستی بزانێت و هەرچی ئیسلام قەدەغەی دەکات بەڕاستی بزانێت.

٢- كردەوەی دڵ ( عمل القلب ) : واتا ئەو عیبادەتانەی بە دڵ دەكرێت وەكو اعتقاد و ترسان لە الله و پشت بەستن بە الله و خۆشویستن و ئومێد بوون بە الله و ئیخلاس و كردەوەی تری دڵ.

٣- قسەی زمان ( قول اللسان ) : واتا ئینسان لە ڕێگای شایەتمان دان بنێ بە هەموو ئەو ڕاستیانەی كە بە عەقڵ و دڵ بەڕاستی زانیوە و بە دڵ قەبوڵی كردووە دەبێ بە زمانیش دان بەو ڕاستیانە بنێت.

٤- كردەوەی ئەندامەكان ( عمل الجوارح ) : واتا ئینسان ئەو ڕاستیانەی كە بە عەقڵ و دڵ بەڕاستی زانیوە و بە دڵ قەبوڵی كردووە و بە زمان دانی پێ داهێناوە وە بە كردەوەی ئەندامەكان جێبەجێیان بكات و دەبێ بە كردەوە بیسەلمێنێت.

جا مادام ئیمان بەو شێوەیە بێت كەوابوو زیاد و كەمیش دەكات، چونكە بە دڵ دانپێدانان دەگۆڕێت.
بۆ نموونە : بەڕاست خستنەوەی هەواڵ وەكو بینینی خودی ڕووداوەكە نییە بە چاو، هەروەها بەڕاست خستنەوەی هەواڵی كەسێك وەكو بەڕاست خستنەوەی هەواڵی دوو كەس نییە و بەو شێوەیە،

بۆیە پێغەمبەر إبراهیم ﷺ دەفەرمویت: (رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي) (البقرة: ٢٦٠)
واتە: ئەی پەروەرگارم ! پیشانم بدە کە چۆن مردووان زیندوو دەکەیتەوە، الله تعالی پێی فەرموو : بۆ باوەڕت نەهێناوە ؟ وتی : بەڵێ بڕوام پێیەتی ، بەڵام داوای ئەوە دەکەم بۆ ئەوەی ئیمانم زیاتر بێت.

جا ئیمان زیاد دەکات و بەرز دەبێتەوە بەگوێرەی حاڵی دڵ لە ئارامیی و دڵنیایی و نەبوونی گومان، جا مرۆڤ هەست بەو ڕاستییە دەکات لە ناخی خۆیدا، بۆیە کاتێك لە مەجلیسێکی زیکر دادەنیشێت کە ئامۆژگاری و (موعظة) و باسی ئاگر و بەهەشتی تێدا دەکرێت، ئیمان و باوەڕەکەی زیاد دەکات، وەکو بڵێی بە چاو دەیبینێت، بەڵام کاتێکیش کە بێئاگایی دەیگرێت و لەو مەجلیسە هەڵدەستێت، ئەو یەقین و باوەڕەی لە دڵدا کەمتر دەبێتەوە.
بەهەمان شێوە ئیمان بە زیاد ووتنیش زیاد دەکات، واتە ئەو کەسەی دە جار زیکری الله دەکات وەکو ئەو کەسە نییە کە سەد جار زیکری الله دەکات، بۆیە دووەمیان زیاترە.
بەهەمان شێوە کەسێك عیبادەتێك بە شێوەی دروست و تەواو ئەنجام دەدات ئیمانەکەی زیاترە لە کەسێك کە هەمان عیبادەت ئەنجام دەدات بەڵام بەشێوەی ناتەواو و کەم و کورت.

بەهەمان شێوە کردەوەکانیش، واتە ئەگەر مرۆڤ بە ئەندامەکانی کردەوەی ئەنجام دا زیاتر لە کەسێکی تر بێگومان ئیمانەکەی زیاترە لەوەی کە کردەوەی کەمتری ئەنجام داوە، ئەو ڕاستیەش – مەبەستمان زیاد کردن و کەمکردنی ئیمان - لە قورئان و سوننەتدا هاتووە.

الله تبارك وتعالى دەفەرموویێت: (وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلاَّ فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَاناً) (المدثر: ٣١)

واتە: هەر فریشتەمان کردووە بە کاربەدەستی دۆزەخ و، ژمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بۆ تاقی کردنەوەی ئەوانەی کە بێ باوەڕن ، تا ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیا بن و، بڕوادارەکان بڕواکەیان زیاد بکات.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: (وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَاناً فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ)(وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْساً إِلَى رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا وَهُمْ كَافِرُونَ) (التوبة: ١٢٤،١٢٥)

واتە: جا ئەگەر الله تعالى سورەتێکی لە سورەتەکانی قورئان بۆ سەر پەیامبەرەکەی دابەزاند ، ئەو کاتە کەسی وا هەیە لەو دووڕووانە - وەکو نکوڵی و گاڵتەکردنێك - دەڵێت : کێ لە ئێوە ئەم سورەتە بەڕاست دانانی بۆ الله تعالى و ئایەتەکانی زیاتر بوو ؟ ! بەڵام ئەوانەی

كە باوەڕیان بە الله تعالى و پەیامبەرەكەی ﷺ هێناوە ئەوانە بە دابەزینی ئەم سورەتە باوەڕی زیادكردن ، بە زانینی ئەم سورەتە و تێفكرینیان لێی و باوەڕبوونیان پێی و كار پێكردنیان بۆی ، و دڵخۆشیشن بەوەی كە الله تعالى پێی بەخشیون لە باوەڕهێنان و ، دڵنیاییان. بەڵام ئەوانەی كە دووڕوویی و گومان لە ئاینی الله تعالى لە دڵیاندا هەیە ، بێگومان ئەوانە دابەزینی سورەتەكە دووڕوویی و گومان بۆ ئەو دووڕوویی و گومانەیان زیاد دەكات كە پێشتر لەسەری بوون ، وە لەناوچوون ئەوانە لەكاتێكدا كە نكوڵی لە الله تعالى و ئایەتەكانی دەكەن.

هەروەها پێغەمبەری الله ﷺ لە فەرموودەی صەحیحدا فەرموویەتی: ((ما رأيت من ناقصات عقل ودين أذهب للب الرجل الحازم من إحداكن)) أخرجه البخاري، كتاب الحيض، باب ترك الحائض الصوم (٣٠٤).

واتە: هەرگیز نەمبینیوە لە ناتەواوی لە ژیری و دیندا ئەوەندە كاریگەری هەبێت بەشێوەیەك كە مێشكی پیاوی ژیر لای خۆی نەهێڵێت لە یەكێك لە ئێوە (ئەی ئافرەتان)، كەوابوو ئیمان زیاد و كەم دەكات.

## ووتەی سەلەف دەربارەی ئیمان:

حەسەنی بەصری دەڵێت : ئیمان بریتییە لە ووتە و کار.

" سيرة الإمام أحمد " لصالح ص (٨١).

عبيد بن عمير الليثي دەڵێت : ئیمان بە هیوا نییە بەڵکو ئیمان بە ووتەیەکە لە دڵەوە بێت و وە کارێك کە ئەنجامی بدات.

" سيرة الإمام " لصالح ص (٨٢).

يحيى بن سليم دەڵێت : ئیمان بریتییە لە ووتە و کردار.

لە ابن جريج هاتووە بەهەمان شێوە.

" سيرة الإمام " ص (٨٢).

فضيل بن عياض دەربارەی ئیمان دەڵێت : ئیمان لای ئێمە لەناو و دەرەوەیە، دانپێدانان بە زوبان ، قەبوڵ کردن بە دڵ ، وە کارکردنە پێی.

" سيرة الإمام " ص (٨٢).

يحيى بن سعيد دەڵێت : ئیمان ووتە و عەمەلە.

" سيرة الإمام " ص (٨٢).

مالك و شريك و أبو بكر بن عياش و عبدالعزيز بن أبي سلمة و حماد بن سلمة و حماد بن زيد گوتيان : ئيمان زانينه و دانپێدانان و كاركردنه.

" سيرة الإمام " ص (٨٢).

إبراهيم بن شماس دەڵێت : گوێم له (ابن المبارك، وجرير بن عبد الحميد، ويحيى بن سليم، والنضر بن شميل، وبقية بن الوليد، وأبو إسحاق الفزاري، وإسماعيل بن عياش) بوو ووتيان : ئيمان بريتييه له ووته و كار.

" سيرة الإمام " ص (٨٢).

پرسيار كرا له ئيمام (أحمد) دەربارەی قەومێك كار ناكەن و دەڵێن تەوەككول مان به الله يه ، فەرمووی : ئەوانه موبتەديعن (بيدعەچين).

" مسائل صالح " (٤٣٠).

ئيمام (أحمد) دەڵێت: پێم گەيشتووه كه (مالك بن أنس وابن جريج وفضيل بن عياض ) گوتويانه: ئيمان بريتييه له ووته و كار.

" مسائل أبي داود " (١٧٦٠).

## ڕوونکردنەوەیەك بە کورتی سەبارەت بە:

ـ ئەصڵی ئیمان.
ـ ئیمانی واجب.
ـ ئیمانی موستەحەب.

**ئەصڵی ئیمان:** هەموو قەول و وتەیەك یان هەموو فعل وکردارێك دەگرێتەوە کە تەرککردنی کوفر بێت ، ئەنجامدانی ئەصڵی ئیمانە ، وە هەموو قەول و وتەیەك یان فعل و کردارێك دەگرێتەوە کە ئەنجامدانی کوفر بێت ، تەرککردن و واز لێهێنانی ئەصڵی ئیمانە.

### بەشێوەیەکی ڕوونتر و نموونە هێنانەوە:

**بڕگەی یەکەم:** هەر قسەیەك یان کردارێك ئەگەر تەرکی بکەی و ئەنجامی نەدەی پێی کافر ببیت ، ووتن و ئەنجامدانی ئەصلی ئیمانە.

**نموونە: ووتە:** تەرککردن و نەگوتنی کەلیمەی تەوحید " لا اله الا الله "کوفرە ، گوتنی ئەصلی ئیمانە.
**کردەوە:** تەرك کردنی نوێژ کوفرە ، ئەنجامدانی لە ئەصلی ئیمانە.

**بڕگەی دووەم:** وە هەر قسە و کردەوەیەك ئەگەر بیڵێی یان ئەنجامی بدەی پێی کافر ببیت ، تەرككردنی ئەصڵی ئیمانە.

**نموونە: ووتە:** جنێودان بە الله تعالی کوفرە ، تەرككردن و نەگوتنی لە ئەصڵی ئیمانە.
**کردەوە:** سوجدە بردن بۆ بتێك یان حەیوان سەربڕین بۆ جگە لە الله تعالی کوفرە ، وازلێهێنان و نەکردنی لە ئەصڵی ئیمانە.

جا هەر کەسێك ئەصڵی ئیمانی هەبێت بە ئیزنی الله تعالی دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەرچی کەم و کورتیشی لە ئیمانی واجب هەبێت.
وە هەرکەسێك ئەصڵی ئیمانی نەبێت پێی ناگوترێت موسڵمان ئەگەرچی ئیمانی واجبیشی هەبێت.

**ئیمانی واجب:** ئەم ئیمانە پاش ئەصڵی ئیمان دێت و ئەصڵی ئیمان زیاد دەکات. هەموو کردارێك دەگرێتەوە تەرككردنی حەڕام بێت ، ئەنجامدانی ئیمانی واجبە ، وە هەموو کردارێك دەگرێتەوە ئەنجامدانی حەڕام بێت ، تەرككردنی لە ئیمانی واجبە.

**بەشێوەیەکی ڕوونتر و نموونە هێنانەوە:**

**بڕگەی یەکەم:** هەر عەمەل و کردەوەیەك وازلێهێنانی حەڕام بێت ئەوە ئەنجامدانی لە ئیمانی واجبە.

**نموونە:** چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك و جیهاد و ئەمانەت پارێزی و ... هتد ، تەرككردنی ئەمانە حەڕامە و ئەنجامدانی لە ئیمانی واجبە.

**بڕگەی دووەم:** هەر عەمەل و کردەوەیەك ئەنجامدانی حەڕام بێت ئەوا تەرككردنی لە ئیمانی واجبە.
**نموونە:** وەك ، زینا و دزی و عارەق خواردنەوە و ڕیبا ... هتد ، ئەنجامدانی ئەمانە حەڕامە و تەرككردنی لە ئیمانی واجبە.

**ئیمانی موستەحەب:** ئەمەش پاش ئەصڵی ئیمان و ئیمانی واجب دێت و ئیمانی واجب زیاد دەکات. هەر کردەوەیەك تەرككردنی مەکروهـ بێت ئەنجامدانی لە ئیمانی موستەحەبە ، وە هەر کردەوەیەك ئەنجامدانی مەکروهـ بێت تەرككردنی لە ئیمانی موستەحەبە.

**بەشێوەیەکی ڕوونتر و نموونە هێنانەوە:**

**نموونە:** سیواك کردن ، تەرككردنی مەکروهە ، ئەنجامدانی لە ئیمانی موستەحەبە. خەوتن لەسەر زگ مەکروهە و وازهێنانی لە ئیمانی موستەحەبە.

ئێستا ڕوون بوویەوە کە ئەصڵی ئیمان پەیوەندی بە کوفر و ئیمانەوە هەیە و ئیمانی واجب پەیوەندی بە واجبەکان و حەڕام کراوەکان هەیە و ئیمانی موستەحەبیش پەیوەندی بە موستەحەبات و شتە مەکروهەکان هەیە.

جا هەر کەسێك ئەصڵی ئیمانی هەبێت ، ئەوە موسڵمانە و دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەر چی لە ئیمانی واجب و ئیمانی موستەحەب کەم و کوڕی هەبێت ، بەڵام هەرکەسێك ئەصڵی ئیمانی نەبێت موسڵمان نییە ئەگەرچی ئیمانی واجب و موستەحەبیشی هەبێت.

## * والقرآن كلام الله غير مخلوق، بجميع جهاته *

قورئان ووتەی  الله یە و دروست کراو (مخلوق) نییە، بە هەموو شێواز و ڕووەکانییەوە.

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە قورئان ووتەی الله یە و ئەو فەرموویەتی و لە الله وە هاتووە، وە حوکمەکەی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، الله تعالی بە حەقیقەت قسەی پێ کردووە.

الله تعالی ناوی لە قورئان ناوە (کلام الله) ووتەی الله.

الله سبحانه وتعالی دەفەرموویت: (وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ) (التوبة: ٦)

واتە: جا ئەگەر کەسێك لە هاوبەش دانەرەکان داوای هاوسێیەتی و پەنادانی لێت کرد ئەوە پەنای بدە هەتا ووتەی الله (قورئان) ببیستێ لەپاشان بیگەیەنە جێگای هێمنی خۆی، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە دەستە و کۆمەڵێکن هیچ نازانن.

هەروەها الله تعالی خۆی قورئانی نازل کردووە و هێناویەتییە خوارەوە.

الله عز وجل دەفەرمووێت: (وَبِالْحَقِّ أَنْزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ) (وَقُرْآَنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنْزِيلاً ) (الإسراء: ١٠٥، ١٠٦)

واتە: جا ئەم (قورئانە) مان بەحەق ناردۆتە خوارەوە و بەحەق و ڕاستیش هاتووەتە خوارەوە.

هەروەها قورئانمان بەش بەش بۆت ناردووە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بە لەسەرخۆیی و هێواشیی، جا ئەم (قورئانە) مان بەو شێوە دابەزاند.

ئەم دوو ئایەتە و چەندین فەرمووده و ئایەتی تر دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە قورئان ووتەی الله یە و الله نازلی کردووە.

هەرکەسێکیش بڵێت قورئان مخلوقە کافرە بە اجماعی زانایانی سەلەفی ئوممەت. هیچ کاتێك نەزانراوە کە گوترابێت قورئان مخلوقە تا ئەو کاتەی بیدعە و بیدعەچیەکان پەیابوون، وە هیچ کەسێك نەیگوتووە قورئان مخلوقە تا ئەو کاتەی کتێبە فەلسەفیەکان وەرگێڕان و کتێبە یۆنانیەکان و هاوشێوەیان.

دوای ئەوە موعتەزیلەکان ئەم قسەیەیان گووت چونکە ئەوان عەقڵیان خستە سەرووی قورئان، تا وایان کرد بڕیار بە عەقڵ لەسەر دەقەکانی وەحی بدەن.

بەڵگەکان زۆرن لەسەر ئەوەی کە قورئان ووتەی الله یە و مخلوق نییە، لێرەش چەند بەڵگەیەك دەخەینە ڕوو:

## بەڵگەی یەکەم:

قال الله تعالى: (إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) (الأعراف: ٥٤)

واتە: بەڕاستی پەروەردگارتان ئەو (الله) خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە، پاشان (الله) چووە سەر عەرش (ئێمە ئیمانمان پێیەتی بەڵام شێوەکەی و چۆنیەتییەکەی نازانین) بە (تاریکایی) شەو (ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێ (بە پێچەوانەشەوە) (ڕۆژ بەشوێن شەووەوەیە بە خێرایی و) شەو بەشوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی، خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش ژێربار کراون بە فەرمانی خۆی، بێدار بن کە بەدی هێنان و فەرمانداران هەر بۆ الله یە، پاك و بێ گەردە (لە هەموو کەم و کوڕی یەك) (الله) خوای پەروەردگاری جیهانیان.

**پێویستی ئەم ئایەتە لە دوو ڕووەوەیە:**

**یەکەم:** الله تعالی جیاوازی کردووە لە نێوان خلق و امر (دروستکراو و ئەمرکردن) ئەمەش دوو سیفەتن لە سیفەتەکانی کە دەگەڕێتەوە بۆ زاتی خۆی، (الخلق) دروستکەر کاری ئەوە، (والامر) بڕیاردان و ئەمرکردن گوتەی ئەوە.

**دووەم:** دروست کردن بە بڕیارە.

الله تعالی دەفەرموویت: (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ) (يس: ٨٢)

واتە: بەڕاستی کاری ئەو (الله) ئەمەیە هەر کاتێ بیەوێ شتێك بەدی بێنێ پێی دەڵێ ببە دەست بەجێ (ئەو شتە) دەبێت.

لێرەدا ووشەی (کن) ئەمری الله تعالی یە، ئەگەر مەخلوق بێت ئەوا دروستکردنی (خەلقی) پێویستی بە (امر) بوو، وە ئەمر لەسەر ئەمریش بێ کۆتایە، ئەمەش باطلە.

امام احمد (رحمه الله) زیاتر ڕوونی دەکاتەوە لەسەر قسەی موعتەزیلەکان و دەڵێت: الله تعالی دەفەرموویێت: (ألا له الخلق والأمر) (الأعراف: ٥٤)

واته: ئایا دروست کردن و فەرمان دەرکردن هەر بۆ الله تعالی نییه ؟.

لێره الله تعالی جیاوازی کردووه له خەلق و بڕیار.

## بەڵگەی دووەم:

قال الله تعالی: (الرَّحْمَنُ . عَلَّمَ الْقُرْآنَ . خَلَقَ الْإِنْسَانَ) (الرحمن: ١-٣)

لێرەشدا الله تعالی جیاوازی کردووه له نێوان زانستی و خەلقی.

کەواته قورئان زانستی الله یه و، مرۆڤ خەلقی الله یه و، علمی الله ش مخلوق نییه.

امام احمد (رحمه الله) دەفەرموویت : قورئان زانستێکه له زانستەکانی الله، هەرکەسێك بڵێت مخلوقه کافر دەبێت.

## بەڵگەی سێیەم:

بەڕاستی مرۆڤ کەمێك لەم ئایەتە تێفکرێت قەت نابێت بیری بۆ ئەوە بچێت کە قورئان مخلوق بێت .!

قال تعالى: (قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا) (الكهف: ١٠٩)

واتە: ئەی (محمد (صلى الله عليه وسلم) ) بڵێ ئەگەر (ئاوی) دەریاکان ببوایە بە مرەکەب بۆ (نوسینی) کەلام و ووتەی پەروەردگارم بێگومان (ئاوی) دەریاکان تەواو دەبوون پێش ئەوەی زانیاری و عیلمی پەروەردگارم تەواو ببێت، ئەگەر چەند ئەوەندەی دەریاکانیش بێنین (بیکەین بە مرەکەب عیلمی الله تەواو نابێت) بڵێ (بەو بێ باوەڕانە) بێگومان منیش تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە.

وقال تعالى: (وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (لقمان: ٢٧)

لێرەدا پەروەردگار بەیان دەکات بە گوتەی حەق کە ووشەکانی بـــێ کـــــــۆتان !!

واتە: بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت لە زەوی دایە قەڵەم و پێنووس بێت هەموو دەریای زەوی ببێتە مرەکەب حەوت دەریای تر دوای ئەوەی باسکرا ببێت بە مرەکەب، ووتە و زانراوەکانی الله دوایی نایەن و تەواو نابن، بەڕاستی الله زاڵی کار دروستە.

جا لەم بەیان کردنەش لە گەورەیی گووتەی الله تعالی یە، لە وەسفی و زانستی، ئەمەش پێوانە ناکرێت بە گووتەی مرۆڤ کە لەناو دەچێت. ئەگەر قورئانیش مخلوق بێت ئەوە پێش دەریا، لە دەریاکاندا کۆتایی پێدەهات. بەلام الله تعالی لەناوچوونی بۆ مرۆڤ نووسیوە و داناوە نەك بۆ خۆی و سیفەتی مەزنی. ئەمە چەند نموونەیەك بوو بە کورتی، دەیان نموونەی تر لە فەرموودە و ئایەتی قورئاندا هەن جەخت لەوە دەکەنەوە کە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە بڵێن قورئان مخلوقە.

جا یەکێك لەو گروپە گومڕایانەی کە لەم بابەتە تێکەوتوون ئەشعەرییەکانن.

سەرەتا دەبێت بزانین مەزهەب و ڕێچکەی ئەشاعیرە کۆکراوەی دوو مەزهەبی دەرچوو لە دینن ئەوانیش بیروباوەڕی جەهمی و سۆفییە گۆڕ پەرستەکانن.

مەزهەبی جەهمی کە نکۆڵی سیفاتی الله دەکەن و بڕوایان بە (علو) ی الله نییە بۆ سەر عەرش و مەسەلەی خەلقی قورئان و هەندێکی دی لە بیروباوەڕی ئەوان ... کە سەلەف جەهمییەکانیان کافر کردووە ، ئەشاعیرەش هەڵگری هەندێك لەو بیروباوەڕە کوفرییەی ئەوانن.

هروی لە ذم الکلام (٥/ ١٣١-١٤٤) موقارەنە دەکات لە نێوان جەهمی و ئەشاعیرەدا و ڕووی لێکچوونیان بەیان دەکات و باس لە فێڵ و تەڵەکەبازییان دەکات لەگەڵ خەڵکی جاهیل دا هەتا ئەوەی پێیان دەڵێت مێینەی جەهمی.

ابن حنبلی لە الرسالة الواضحة في الرد علی الاشاعرة (٢/ ٤٥١) دەڵێت: وتە و بیروباوەڕی ئەمانە زاهیرەکەی جوان و ڕازاوەیە بەڵام ناواخنی کوفر و گومڕاییە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازییەك نییە لەنێوان ئەشاعیرە و جەهمییەکاندا تەنها لە شتانێکی کەمدا نەبێت، کە ئەمەش واناکات حوکمی ئەوانیان نەبێت بەڵکو هەمان حوکمیان هەیە.

جا ئەشاعیره باوەڕیان بەوە نییە کە قورئان کەلامی الله یە بەڵکو دەڵێن قورئان مخلوقه والعیاذ بالله.

(ئەشعەری) الباجوری لە شرح الجوهرة دەڵێت: قورئان بە واتای لفظ کە دەیخوێنیتەوە مەخلوقه.

(ئەشعەری) الرازی لە نهایة العقول دەڵێت: بزانە ڕاستی ئەوەیە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان ئێمە و ئەوان (واتە ئەشاعیره و معتەزیله) لەوەی کە دەڵێن قورئان مەخلوقه.

ابن الحنبلي لە کتێبە ناوازەکەیدا الرسالة الواضحة في الرد على الاشاعرة (٢/ ٦٨٤) لە باسی خەلقی قورئاندا دەڵێت: بزانە براکەم الله ئێمە و ئێوەش تەوفیق بدات، ئەشعەریەکان لە پوچەڵ کردنی قورئاندا ڕێگای باطنیەکانیان گرتووە لە ئیلحاد و زەندیق بوون دا.

اللالکائي لە کتێبی اعتقاد اهل السنة (٢/ ٣٣٠) دەفەرموویت: بەڵگەی ئایەت لە قورئان وە لەوەی ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵان و تابعین هاتووە لەسەر ئەوەی کە قورئان الله تعالى قسەی پێ کردووە لەسەر حەقیقەت (لفظ و حرف و صوت نەوەك مجاز و حیکایەت) وە دابەزیوە بەسەر محمد (صلى الله عليه وسلم) ، وە فەرمانی پێ کردووە تەحەدای پێوە بکات ، وە بانگەوازی خەڵك بکات بۆی ، وە قورئانە لەسەر حەقیقەت خوێندراوەتەوە لە میحرابەکان ، وە نووسراوەتەوە لە کتێبەکان وە پارێزراوە لە سنگی

پیاوەکان نە (حیکایەت و ڕشتەیە لە قورئان. ئەوە عەقیدەی ئەشعەریەکانە). هەمووی یەك قورئانە و مخلوق نییە. بەڵکو سیفەتێکی زاتییە کە هەرگیز لێی نابێتەوە. پێشتر و هەردەم و دواییش هەر قسەکار بووە ، ئەوەی جگە لەوە بڵێت کافرە و گومڕایە و گومڕاکەر و بیدعەچیە پێچەوانەی مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە.

ئیمامی السجزي رحمه الله پاش ئەوەی باسی فیتنەی خەلقی قورئان دەکات ، وە باس لە کافر بوونی ئەوانە دەکات کە گوتەر بوونە بۆ خەلقی قورئان لەم ڕیزەوە لە بەشی پێنجەم ناوی ئەم جەمعە خەبیثە دەهێنێت ئەوانیش : ئەشعەرییەکانن کە دەڵێن: قورئان ووتەی الله تعالی ـیە بەڵام سورەت و ئایەتەکانی (مصحف) ووتەی الله تعالی نین بەڵکو ووتەی نەفسیە حەرف و سەوتەکە مخلوقە.

الرد على من انكر الحرف والصوت ص: (١٣٧)

سەیر بکەن ئەشعەریەکان یەك دەنگن لەگەڵ ئەوانەی کە دەڵێن: قورئان مەخلوقە وە زیاتریش دەڵێن.

وە ئەهلی سوننە ئەم جۆرە عەقیدەیان بە گومڕایی و کوفر زانیوە و تەکفیری هەر کەسێکیان کردووە کە بڵێت قورئان مەخلوقە کە لە کاتی خۆی دێینە سەری ان شاء الله.

## * والقدر خيره وشره من اللّٰه عز وجل *

قەدەر بە خەیر و شەڕەوە لەلایەن الله تعالی وەیە.

**قەدەر:** ئیمام احمد (رحمه الله) لە باسی ئیمان بوون بە قەدەر دەفەرمووێت: یەکێك لەو سوننەت و مەنهەجە جێگیرەی صەحابە (رضي الله عنهم) و ئەهلی سوننە و جەماعە ئەگەر خەسڵەتێکی تەرك بکەیت و ئیمانت پێی نەبێت و قبوڵی نەکەیت ئەوە بە ئەهلی سوننە دانانرێیت ئەویش بریتییە لە ئیمان بوون بە قەدەر بە خەیر و شەڕیەوە و بەڕاست زانینی ئەو حەدیسانەی لەو بارەیەوە هاتوون، وە دەفەرمووێت: وە ئیمان بهێنن پێی و نالێین بۆچی ئاوەهایە دەبوو وەها بوایە، دەبێ بەڕاستی بزانی و ئیمانی پێ بێنیت. قەدەر ڕوکنێکی ئیمانە کە ئەگەر ئیمانت پێی نەبێت باوەڕبوونت بە تەواوی ئەرکانەکانی ئیمان هەڵدەوەشێتەوە. کەواتە مرۆڤ لە بابی قەدەر دەبێت بڕوای بەوە هەبێت کە الله عالمە بەوەی لە داهاتوو ڕوودەدات وە هەمووی لە لوح المحفوظ نووسیوە، وە هیچ لە کەوندا ڕوونادات ئیلا دوای ئیرادەی الله نەبێت، واتە الله تعالی ئیرادە و ویستی لەسەرە ئەگینا هەرگیز ڕوونادات، وە ئیمان بوون بەوەی الله سبحانه وتعالی دروستکەری هەموو شتە، هیچ شتێ بوونی نییە ئیلا الله عز وجل خالقیەتی، لەوانەش کارو کردەوەی بەندە بەڵام بەندە کارەکە ئەنجام دەدات، وە ئیمان

بوون بەوەی کە ئەوەی توشت دەبێت بەهۆی هەڵەی خۆتەوە نییە وە ئەوەی هەڵەت کردووە بەهۆی ئەوە نییە کە توشت بووە هەمووی ئیمان بوونە بە قەدەر، واتە شتێکت توش بوو مەڵێ ئاوام بکردایە ئاوا دەبوو، نا بەڵکو هەر شتێکت کردبایە هەر ڕوویان دەدا وەکو رسول الله (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: [ ئەگەر هەموو ئوممەت کۆ ببنەوە سوودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن ئیلا بە شتێ نەبێ کە الله نووسیویەتی، وە هەموو ئوممەت کۆ ببنەوە ناتوانن زیانێکت پێ بگەیەنن ئیلا بە شتێ نەبێ کە الله نووسیویەتی لەسەرت، هەموو شت نووسراوەتەوە ]. رواه الترمذي.

ئیمام ابن بطة لە الإبانة دەفەرمووێت: الله ئادەمی دروست کرد وە کارو کردەوەیانی نووسی، قەدەری بەسەردا هێنان، وە ڕزق و ڕۆزی دابەش کرد و دیاری کرد، وە ئەجەلی دیاری کردن وە زانایە بە کارو کردەوەیان، وە الله سبحانە وتعالى خێر و شەڕی دروست کردووە، وە کەسانێکی دروست کردووە پەیڕەوی هەریەك لەوانە بکەن. وە هەر ئیمام ابن بطة لە الإبانة دەفەرمووێت: ئیمان بوون بە قەدەر لەسەر دوو شێوەیە: یەکەم واجبە لەسەرمان بیزانین و عیلممان پێی هەبێ و ئیمانمان پێی هەبێ و بەڕاستی بزانین، وە جۆری

دووەمیش حەرامە لەسەرمان بیری لێ بکەینەوە و پرسیار کردن و جیدال و گفتوگۆ کردن لەسەری وە ڕۆچوون دەربارەی.

جۆری یەکەم کە بریتییە لەسەرمان ئیمانمان پێی هەبێ و بەڕاستی بزانین و ئەوەی دەربارەی قەدەری هاتووە ئیقراری پێ بکەین و دانی پێدابنێین و ئەوەی پێویستە زانستمان لەسەر هەبێت ئەوەیە کە بزانین خێر و شەڕ هەر لە الله وەیە وە سەرپێچی و گوێڕایەڵی بە ئەمر و قەزاو قەدەری الله بەڕێوە دەچێت، وە ئەوەی توشمان بووە بەهۆی هەڵەوە نییە کە کردوومانە، وە ئەوەی هەڵەمان کردووە بەهۆی ئەوەوە نییە کە توشمان بووە بەڵکو قەدەری الله یە سبحانە وتعالی بەڵام فیعل و کردەوەی بەندەیە و الله خالقە سبحانە وتعالی. الله تبارك وتعالی بەهەشتی دروست کردووە و خەڵکەکەی ناویشی دروست کردووە و ناوەکانیشیان دەزانێ و ناوی باوکیشیان دەزانێ و دروستی کردوون بۆ کارو کردەوەی باش کە پێی ڕازییە و توانای پێ بەخشیون وە هاوکاریشی کردوون بۆ ئەوەی چاکە ئەنجام بدەن، جەهەنەم و ئەهلەکەیشی دروست کردووە و دیاریشی کردووە و ژمارەیان دەزانێت، وە زاناشە بە ناویان و هەموو ئەو شتانەی لەسەر نووسیون، عەزابیان دەدات لەبەرئەوەی کە ئەنجامی دەدەن بێ ئەوەی زوڵمیان لێ بکات، وە ئەوانیش هیچ عوزرێکیان نییە بۆ ئەو حوکمەی داوە بەسەریاندا، هەموو ئەمانە و هاوشێوەکانی لە عیلمی قەدەرن وە

پێویستە هەموو کەس عیلمی پێی هەبێت و ئیمانی پێی هەبێت و تەسلیمی حوکمی الله سبحانە وتعالی بین. (لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ) (الأنبياء: ٢٣).

پرسیار ناکرێ لە الله لەوەی ئەنجامی دەدات بەڵکو مەخلوقەکان پرسیار لێ کراون. ئەمە ئەو جۆرەیە لە بابی قەدەر کە پێویست و واجبە باوەڕی پێ بێنین و بیزانین بەڵام ئەوەی حەرامە تێڕامانە لە قەدەر و بیرکردنەوە لە چۆنیەتی و بڵێین بۆچی وایە و هۆکارەکەی چییە چونکە ئەمە لە عیلمی الله یە نە مەلائیکەت و نە پێغەمبەران نایزانن.
بەڵێ الله سبحانە وتعالی دەیزانی کە ئیبلیس سەرپێچی دەکات بەڵام دروستی کردووە، زانیشی بێ فەرمانی دەکات و بەندەکانی گومڕا دەکات بەڵام دروستی کردووە، ئەوەی لەسەرمانە ئیمانمان بە قەدەر بێت نەك چۆنیەتی.

(فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ) (الأعراف: ٣٠).
وە هیدایەت و گومڕاییش بەدەستی الله یە تبارك وتعالی، کۆمەڵێك الله هیدایەتیان دەدات و کۆمەڵێك گومڕا دەکات.

(يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (البقرة: ١٤٢).
کێی بوێ ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێبازی ڕاست.

(إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ) (القصص: ٥٦).

ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنموونی بکەیت بەڵام الله هەرکەسی بوێ هیدایەتی دەدات و ئەوە الله یە زانایە بەوانەی ڕێنموونی وەرگرن.

(وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ) (الشورى: ٨).

الله سبحانه وتعالى دەیتوانی هەموو ئادەمیزاد بە موسڵمانی بهێڵێتەوە بەڵام هیدایەت تەنها بەو کەسانە دەدات کە خۆی دەیەوێت.

(وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) (التكوير: ٢٩).

ئێمە مەشیئەتمان نییە ئیلا لەدوای مەشیئەتی الله وە کە شتێکی بوێ ئیلا ئەو کاتە دەتوانین ئەنجامی بدەین چونکە مەشیئەتی ئێمە هیچ بەهایەکی نییە ئەگەر الله ویستی لێ نەبێت. وە باوەڕمان وایە کەسانێکی بۆ بەهەشت و کەسانێکی بۆ جەهەنەم دروست کردووە.

ئیمامی عمر دەفەرمووێ: پرسیار کرا لە رسول الله (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی ئەو ئایەتەی الله تعالى دەفەرمووێت: (وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ

مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَىٰ) (الأعراف: ١٧٢).

وه كاتێك پەروەردگارت وەری گرت پەیمان لە پشتی ئادەمییەکان وەچەو نەوەکانیان وە کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە پێی گوتن ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم ؟ گوتیان: بەڵێ، شایەتیان داوە.

ئەویش فەرمووی: الله سبحانە وتعالى ئادەمی دروست کرد بەدەستی موبارەکی مەسحی پشتی ئادەمی کرد، لە پشتی ئادەم نەوەکانی دەرکرد و فەرمووی من ئەمانەم بۆ بەهەشت دروست کردووە وە بە کارو کردەوەی ئەهلی بەهەشت کار دەکەن، پاشان دیسان مەسحی کرد و کۆمەڵێکی دروست کردووە لە ئەهلی ئاگر و بە کارو کردەوەی ئەهلی ئاگر کار دەکەن. ئیمانمان بەو حەدیسە هەیە و ئیمانمان بەوە هەیە الله تعالى ئەو بەڵێنەی لێمان وەرگرتووە. کە ئەم حەدیسەش واتاکەی سەحیحە، وە ئیمانمان بەوە هەیە کە الله تبارك وتعالى قەدەری هەموو ئەو شتانەی دیاری کردووە کە دروستی کردوون، وە هەرکەس باوەڕی بەمە نەبێت لە فرقە گومڕاکانە.

رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: الله سبحانە وتعالى ژیانی هەموو دروستکراوەکانی نووسیوە پێش ئەوەی ئاسمان و زەوی دروست بکات پێش پەنجا هەزار ساڵ، وە ئەو کاتەش عەرش لەسەر ئاو بووە. صحيح مسلم.

به پەنجا هەزار ساڵ لەپێش دروستکردنی کەون و کائینات قەدەری ئێمەی نووسیوە، کەواتە باوەڕمان بە هەموو ئەو شتانە هەیە کە ڕوودەدەن، الله تعالی قەدەرێکی بەسەر هێناون و علمت پێ هەبووە وە بە بەندەکانی کە دروستی دەکات و عیلمی بە ئادەم هەبوو کە لە بەهەشت دەری دەکات و ئیبلیس سەرپێچی دەکات و سوجدە بۆ ئادەم نابات بەڵام دروستی کرد و کارو کردەوەی بەندەکانیشی دروست کردووە و بەندە خۆی فاعیلی کارەکەیە، کارەکە حەڵاڵە یان حەڕامە، ڕزقت بە حەڵاڵ یان حەڕام بەدەست دێت، هەتا زینا کردن و قەتل و ڕیبا هەمووی بە قەدەری الله یە چونکە حەدیسەکە دەفەرموویێت ئیمان بوون بە قەدەر بە خەیر و بە شەڕیەوە.

کە دەڵێیت قەزا و قەدەر وەك ئیسلام و ئیمان وایە، واتە ئەگەر بە تەنها قەدەر بەکارهێنرا قەزاش دەگرێتەوە، وە ئەگەر قەزا بەکارهێنرا قەدەریش دەگرێتەوە. قەدەر بریتییە لە علمی الله بەو شتە، وە نووسینەوەی لە لوح المحفوظ ـدا وە مەشیئەتی الله بۆ ڕوودانی ئەو کارە. وە قەزاش بریتییە لە هێنانە بوون و ڕوودانی شتەکان، کارەکە نووسراوەتەوە و الله عیلمی پێیەتی و مەشیئەتی لەسەریەتی کە قەدەرەکە ڕوویدا دەبێتە قەزا. وە ئەگەر بەتەنها هاتن، قەدەر عیلم و مەشیئەت و نووسین، وە قەزاش ڕوودانی شتەکان.

قەدەر پەیوەستە بە پایەکانی تری ئیمانەوە، کە ئیمان بوون بە الله و فریشتەکانی و پێغیمبەرانی و کتێبەکانی و باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی و قەدەر بە خێر و شەڕیەوە، ئەم شەش بنچینەیە بە کتاب و سوننەت گەیشتوون بە ئێمە، کۆڕای موسڵمانان لەسەری یەکدەنگن وە ئینکاری هەر کامیان بکەیت لە دائیرەی ئیسلام دەچیتە دەرەوە والعیاذ بالله.

(آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ) (البقرة: ٢٨٥).

(وَلَـٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ) (البقرة: ١٧٧). بەڵکو چاکەی ڕاست و دروست ئەمەیە کە باوەڕی ڕاستەقینەی بە الله و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتە و بە کتێبی ئاسمانی و بە پەیامبەرانی الله هەبێ. پێنج ڕوکنی لەم ئایەتە فەرموو.
لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) (القمر: ٤٩). ئێمە هەموو شتێکمان بە قەدەر دروست کردووە.

وە دەفەرمووێ: (وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا) (الفرقان: ٢).
هەموو شتێکی لە نەبوون و (عەدەم)ـەوە دروستکرد و بەدی هێناو ، ئەندازەگیری تەواویشی بۆ کرد ، بە میزانێکی ورد.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ (النساء: ١٣٦)

ئەمە بە نەصی ئایەت کە ئەم شەش ڕوکنە بەیان کراوە بۆمان، وە هەروەها بە حەدیسە مەشهورەکەی جبریل کە هاتە خزمەت رسول الله (صلی الله علیه وسلم) کە ئیمامی عمر بۆمان دەگێڕێتەوە لە باسی پرسیاری ئیسلام و ئیمان و ئیحسانی لێ کرد، وە پرسیاری عەلاماتەکانی هاتنی قیامەت لە مەسەلەی ئیماندا دەفەرموویێت: باوەڕبوون بە الله و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی و کتێبەکانی و ڕۆژی دوایی و قەدەر بە خێر و شەڕیەوە، کەواتە هەرکەس باوەڕی بە قەدەر نەبێت باوەڕی بە ئەرکانەکانی تر نییە.

## قەدەر چوار مەرتەبەیە :

**مەرتەبەی یەکەم:** عیلم بوون، واتە الله سبحانه وتعالى عیلمی هەیە پێش ئەوەی شتەکە ڕوو بدات وە نووسیویەتی وە ئیرادەی لێیە کە ڕوو بدات ئەگینا هیچ شتێ بێ مەشیئەتی الله ڕوو نادات وە دەیهێنێتە بوون و دروستی دەکات، باوەڕبوون بە مەرتەبەی یەکەم کە عیلمی الله یە لە ڕابردوو و داهاتوو هەمیشە و بەردەوام، عیلمی ڕابردوو کە

بیدایەتی نییە بە نسبەت الله وە، الله ئەو یەکەمەیە کە هیچ دەستپێکی نییە وە ئەو ئاخیرەیە کە کۆتایی نایە، الله تبارك وتعالی عیلمی بەو شتانە هەیە پێش ڕوودانیان وە ئەوانەش کە ڕوویان نەداوە ئەگەر ڕوو بدەن چۆن دەبن.

الله سبحانه وتعالی دەفەرموویێت: (بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ) (الانعام: ٢٨).

ئەگەر گریمان بشگێڕڕێنەوە بۆ دونیا، ئەو کارانەی ڕێیان لێدەگیرا، هەم دیسان دەچوونەوە سەریان و هەر دەیانکەن، بەڕاستی درۆ دەکەن و لە درۆزنانن.

الله تعالی عالمە بەوەی ئەگەر جەهەنەمیەکان بگەڕێنەوە بۆ سەر زەویش دووبارە کارو کردەوەی خراپ ئەنجام دەدەن، الله عیلمی بە داهاتوویەکە کە ڕووی نەداوە و چۆنیەتی ڕوودانەکەی عیلمی پێ هەیە بۆیە دەفەرموویێت لَكَاذِبُونَ ڕاست ناکەن و لە درۆزنانن، چاکە و باشە ناکەن و ناگەڕێنەوە.

کەواتە مەرتەبەی یەکەم عیلمی الله یە بە هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕابردوودا بوون پێش ئەوەی ڕوو بدەن وە ئەو شتانەی کە لە داهاتوو ڕوودەدەن وە ئەگەر ڕوو بدەن چۆن ڕوودەدەن وە ئەگەر شتانێك ڕوونەدەن لە داهاتوو ڕوو بدەن چۆن دەبن. کەواتە هیچ لەحزە و

سات و مەكانێك نییە الله عیلمی پێ نەبێت و سەرەتا و کۆتایی نییە و عیلمی الله سیفەتی الله یە و سیفەتی الله سەرەتا و کۆتایی نییە.

**مەرتەبەی دووەم:** ئیمان بوون بە نووسینی قەدەر لە لوح المحفوظ کە هەموو شتێکی لێ نووسراوە لە کردار و ڕزق و ئەجەل و خۆشبەختی و دڵتەنگی و هەژاری و دەوڵەمەندی و سەربەرزی و سەرشۆڕی و ژیان و مردن و تەمبەڵی و چالاکی و هەمووی نووسیوە الله سبحانە وتعالی فكل شيء مكتوب .. (أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ) (الحج: ٧٠). مەگەر تۆ نەتزانیوە ئەی مرۆڤی ژیر! کە هەرچی لە ئاسمان و زەوی دایە کە الله ئاگای لێیەتی و دەیزانێ ؟ جا کەواتە هەر ئەویش بە تەنها خۆی بە ئاگایە لەو شتانەدا ئێوە ئیختیلافتان تێیدا هەیە. چونکە بە ڕاستی هەموو ئەو شتانە لە نامەی ( لوح المحفوظ ) دا تۆمار کراوە و "هیچی لێ زایە نابێت" ، بێگومان ئەو کارەش بۆ الله زۆر ئاسانە، هەر وەکو ئەم فەرموودەیەش دەسەڵاتی فراوانی الله ڕادەگەیەنێ: ( إن الله قدر مقادير الخلائق قبل خلق السموات والارض بخمسين ألف سنة وكان عرشه على الماء ) مسلم. كتاب القدر ٤/٢٠٤٤.

بێگومان الله پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ و، هەر ئەو دەمەی کە هێمان عەرشیشی بەسەر ئاوەوە بوو ئەندازەگیری و بڕیاری هەموو ڕووداو و کاروباری دروستکراوەکانی خۆیدا.

(مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ) (الحديد: ٢٢).

هیچ شتێکتان توش نابێت لە زەوی و ئاسمان و نەفستاندا ئیلا لە لوح المحفوظ نووسراوە.

(وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ) (الانبياء: ١٠٥).

ئەمەش بەڵگەی قورئانە کە الله عز وجل هەموو شتێکی نووسیوە پێش ڕوودانیان، کە رسول الله (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: الله سبحانه وتعالى قەدەری نووسیوە لە لوح المحفوظ پێش پەنجا هەزار ساڵ پێش ڕوودانیان. کەواتە ئەو دوو مەرتەبە هەرکەس باوەڕی پێ نەبێت کە بریتییە لە (عیلم بە قەدەر نووسینەوەی لە لوح المحفوظ) ئیمانی بە قەدەر نییە. گرووپی قەدەرییەکان باوەڕیان بە ئەم دوو مەرتەبەیە نییە کە لە سەردەمی سەحابە سەریان هەڵدا، هەندێ لە سەحابەی وەك ابن عمر و غەیری ئەویش تەکفیری کردن چونکە

دەیانگوت الله عیلمی بە داهاتوو نییە و جەهلیان دەدایە پاڵ الله والعیاذ بالله، نەقسی سیفەتی عیلمیان کرد بۆ الله و جەهلیان دایە پاڵی.

**مەرتەبەی سێیەمیش لە قەدەر ئیرادە و مەشیئەتی الله یە.**

**دوو جۆر ئیرادەش هەیە:** ئیرادەی کەونی و ئیرادەی شەرعی ...

ئیرادە بریتییە لەوەی کە الله ئیرادە و ویستی هەیە بە هەموو ئەو شتانەی کە ڕوودەدەن وە هەموو ئەو شتانەی کە پێشتر ڕوویان داوە ویستی لێ هەبووە، لەبەرئەوەی هیچ شتێك ڕوو نادات لە کەوندا ئیلا دەبێ مەشیئەتی الله ی لەسەر بێت جا خێر بێت یان شەڕ بێت، گوێڕایەڵی بێت یان سەرپێچی، ئیمان بێت یان کوفر بێت، هەموو شتێك لە وجوددا بە مەشیئەتی الله ڕوو دەدات، هیچ شتێ لە موڵکی الله نابێت کە ویستی لێ نەبێت، ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی لە نێوانیەتی ئیلا بە مەشیئەتی الله دەبێت، کردەوەی بەندە ئەوەی لە تاوان و چاکەشە هەمووی بە مەشیئەتی الله یە، بەڵام ئەوەی کە قەدەرییەکان ئینکاری دەکەن لە تاوانە، گوتیان بەندە خۆی کارو کردەوەی دروست دەکات نەك الله دروستی کردووە، ئەوەش والعیاذ بالله بێ توانایی دەدەنە پاڵ الله کە بەندە کارێك دەکات و الله مەشیئەتی

لەسەر نییە، بەڵام ئەهلی سوننە دەڵێن فیعلەکان بە چاك و خراپەوە دروست دەکات بەڵام بەندە ئەنجامی دەدات.

ئیرادەی کەونی بریتییە لەوەی لە موڵکی الله ڕوو دەدات لە خراپ و لە کوفر، واتە شتانێك ڕوو دەدەن لە کەوندا کە الله سبحانە وتعالی پێی ڕازی نییە بەڵام ڕوو دەدەن بە ئیرادەی کەونی، واتە الله ویستی لەسەرە بەس نایەوێت و ڕقی لێیەتی.

ئیرادەی شەرعی بریتییە لە گوێڕایەڵی و پەرستشی الله سبحانە وتعالی و لەو شتانەی کە ڕوو دەدەن الله پێی ڕازییە.

**مەرتەبەی چوارەم لە قەدەردا دروست کردن:** واتە ئەو کردارانەی ڕوو دەدەن الله کردارەکانی دروست کردووە، بەڵام لێرەدا قەدەرییەکان ئینکاری دەکەن و ئینکاری عمومی خەلق دەکەن و دەڵێن الله کوفر و سەرپێچی دروست نەکردووە بەندە خۆی دروستی کردوون، دەڵێن کرداری بەندە چ ئەوەی خراپە بێت یان چاکە بێت بەندە خۆی دروستی دەکات لەبەر ئەوەی ڕەدی ئەوە بکەنەوە کە الله خۆی هەموو کردارەکانی دروست کردووە و قەدەری بەسەر هێناون و عەزابیان دەدات بە عەقڵی خۆیان پێوانەیان کرد. جا کە شتێك نەصی صەریحی لەسەر هەبوو عەقیدە و مەنهەجێکی دامەزراوی لەسەر بوو قیاس وەرناگرین و بە عەقڵ و مەنتق پێوانەی بۆ ناکرێت، دەبێ نەص

پێشخەی بەسەر عەقڵدا، بۆیە هەموو شتێك كە ڕوو دەدات لە باش و خراپ ویستی الله ی لەسەرە و قەدەری بەسەر هێناون، حیكمەتی الله یە كە هەندێ شت شاراوەبن بە نسبەت ئێمەوە.

**قەدەرییەكانیش دەبن بە دوو بەشەوە:** یەكێكیان ئەوانەن كە ڕەفزی ئەوە دەكەن كە الله تعالى قەدەری نووسیبێ و عیلمی پێ هەبێت، دەڵێن تەنها ئەوەی نووسیوە و عیلمی پێیەتی كە ڕوویان داوە ئەوەی لە داهاتوو ڕوو دەدات عیلمی پێ نییە الله سبحانە وتعالى، ئەمانەش كافرن لەبەر ئەوەی نەزانین دەدەنە پاڵ الله تعالى.

دووەم گروپ ئەوانەن كە باوەڕیان بە عیلمی الله هەیە كە لە ڕابردوو ڕووی داوە و ئەوەشی لە داهاتوو ڕوو دەدات وە نووسیویشیەتی بە ئیرادەی الله بەڵام باوەڕیان وا نییە الله عز وجل كاری بەندەی دروست كردبێت بە باش و خراپەوە، طائیفەی یەكەم باوەڕیان بە عیلم و نووسینەوە نییە، طائیفەی دووەم باوەڕیان بەوە نییە الله كرداری بەندەكانی دروست كردووە، ئەم دوو طائیفەیە پێیان دەگوترێ قەدەرییەی نوفات، واتە هەر یەكەیان شتێكیان نەفی كردووە.

طائیفەیەكی تر لە قەدەرییەكان هەن پێیان دەگوترێ جەبرییەكان، كە باوەڕیان وایە بەندە ناچارە كارو كردەوەكەی بكات و هیچ ئیختیارێكی نییە، واتە الله عز وجل بە زۆر ئەم كارەیان پێ دەكات والعیاذ بالله، وە دەڵێن الله سبحانە وتعالى خۆی نوێژ دەكات و

بەڕۆژوو دەبێت و .. هتد خۆی خودی فیعلەکەیە واتە ئەوەی بەندە دەیکات لە باش و خراپ الله تعالی ناچاریان دەکات، فیعلەکە انتساب دەدەنە پاڵ الله، بەندە بە مەجبور دادەنێن.

## قەدەرییەی جەبەریش دابەش دەبن بۆ دوو بەش:

یەکەمیان موشریکن: ئەوانەن کە ئیحتیجاج دەکەن بە تاوان واتە لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە دەڵێن ئێمە بە قەدەر ئەمە دەکەین واتە ئێمە تاوانمان نییە. ئیحتیجاج کردن بە قەدەر لەدوای تەواوبوونی کارەکە و تەوبە دروستە ئەمەش ڕەئی ئەهلی سوننەیە، بۆ نموونە وەك رسول الله (صلی الله علیه وسلم) بۆمان دەگێڕێتەوە کاتێك موسا علیه السلام بە ئادەم علیه السلامی فەرموو تۆ ئادەمی علیه السلام کە الله دروستی کردووی وە بەندەت دەرکردووە لە بەهەشت ؟ واتە لۆمەی ئادەمی کرد، ئادەم فەرمووی ئەوە تۆ بووی الله سبحانه وتعالی عیلمی هەموو شتێکی پێ بەخشیوی وە هەڵی بژاردووی بەسەر خەڵکیدا بەو پەیامەی پێی داویت ؟ موسا فەرمووی بەڵێ، ئادەم ئیحتیجاجی بە قەدەرە کرد لەدوای تەوبە لەسەر تاوانێك کە ئەنجامی دابوو، نەك تۆ لەناو تاوانەکە بیت بڵێی الله سبحانه وتعالی ناچاری کردووم و من هەر ئەنجامی دەدەم ئەمە گومڕایی و تێنەگەیشتنە لە قەدەر.

وه موشریکین دەیانگوت: (لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا) (الانعام: ١٤٨). ئەگەر الله بیویستایە ئێمە و باوك و باپیرانمان هاوبەشمان بۆ الله دانەدەنا.

لەدوای ئەوە الله سبحانە وتعالی قسەی ئەوان نەقڵ دەکات و دەفەرموویت: (إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ) ( الانعام: ١٤٨). ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناکەون بێجگە لە گومان.

واتە ئیحتیجاجیان بە شتیَ کردووە نابیَ بیکەن و بیکەنە بەڵگە ئەگەر ئەوە بکرێتە بەڵگە کەواتە تا ٧٠ساڵ عیبادەت بکەیت و بڵێی من تۆم پەرستووە بەڵام لە قیامەت الله تعالی پێت بڵیَ هیچم لیَ قەبوڵ نەکردووی چونکە لە قەدەردا وا نووسراوە و پاداشتت بۆ نییە چونکە ناچار بووی، کەواتە چۆن کە تاوان دەکەی دەڵێی ناچارم دەبێت باوەڕیشت وابێت کە چاکەت کرد لێت قەبوڵ نەکرێت، ئیحتیجاج کردن لە کاتی ئەنجامدانی تاواندا بیرۆکەی قەدەرییەی جەبەرییە.

دووەم گرووپیشیان ئیبلیسییە دەڵێن: الله سبحانە وتعالی قەدەری هەموو شتێکی نووسیوە وە مەبەستی لە هەرچی بێت ڕوو دەدات بەڵام پەنا بە الله دەڵێن الله زاڵمە و زوڵم لە بەندەکان دەکات لەبەر ئەوەی بە زۆر ئەو کارەیان پیَ دەکات.

**کەواتە قەدەرییە سێ جۆرە:** جۆرێکیان مەجوسییە، جۆرێکیان موشریکییە، جۆرێکیان ئیبلیسییە.

**مەجوسییەکان دەڵێن:** الله سبحانە وتعالی قەدەری هەموو شتێکی نووسیوە ئیللا ئەفعالی بەندە نەبێت، کارەکان الله دیاری نەکردووە بەڵکو بەندە خۆی کارەکانی دروست کردووە و ئەنجامی دەدات، الله هەموو شتێکی دروست کردووە ئیللا کاری بەندە نەبێت لە چاکە و خراپە، بۆیە ناویش نراون مەجوس چونکە وەك ئەوان بیردەکەنەوە، مەجوسییەکان دەیانگوت دوو خودا هەیە چاکەکە ڕووناکییە و شەڕەکە تاریکییە، قەدەریش نەك دوو خودا بەڵکو هەر بەندەیەك بۆ خۆی کارو کردەوەی خۆی دروست دەکات و الله توانای بەسەر نییە ئەمەش واتا خۆی خالقە پەنا بە الله کوفری ئەمان زۆر ترسناکترە لە مەجوسییەکان. ئەگەر بڵێی هەر بەندە خۆی کارو کردەوەی خۆی دروست دەکات وەك چۆن الله دروستکەرە ئەوە هەر کەسە و خالقە والعیاذ باللە.

**موشریکییەکان:** شەرع بە درۆ دەخەنەوە دەڵێن ئینسان مەجبورە لەسەر ئەو کارو کردەوەی دەیکات مەجبور کراوە، هەموو شتێکیش قەدەرە، ململانێ لە شەرع دەکەن بە قەدەر، بۆ نموونە الله عز وجل

فەرمانی پێ کردووی بە نوێژ بەڵام تۆ ئەنجامی نادەی ئەوە تۆ لەگەڵ قەدەر دایت و هیچ تاوانت نییە، ڕاستە الله فەرمانی پێ کردووی بەس مادام نایکەی ئەمە قەدەرە و ناچاری، ئەمری الله تعالی بە درۆ دەخەنەوە بە مەفهومێکی غەڵەت بۆ قەدەر، بۆیە ناونراوە موشریکی ئیحتیجاج دەکەن بە تاوانەوە لەسەر شەرع چونکە کاتێك کوفر دەکەن دەڵێن ئێمە الله فەرمانی پێ کردووین بیپەرستین بەڵام نایپەرستین قەدەری الله یە. الله عز وجل دەفەرموویێت: (لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ) (النحل: ٣٥). دەربارەی موشریکەکان کە دەڵێن ئەگەر الله ویستی لەسەر بوایە هیچمان نەدەپەرست جگە لە الله بەلام الله ویستی لێیە ئێمە هاوبەش بڕیار بدەین، کەواتە ئیحتیجاجیان کرد بە کوفرەوە بەسەر شەرع.

**ئیبلیسییەکان:** شێخ و گەورەیان ئیبلیسە، ئیمانیان بە شەرع و قەدەر هەیە، ئەمانە دەڵێن الله تبارك وتعالى فەرمان بە شتێك دەکات بەڵام قەدەری پێچەوانەی ئەوە نووسیوە، ڕەخنە لە الله تعالی دەگرن.

کاتێك الله تعالی فەرمانی کرد بە مەلائیکە سوجدە بۆ ئادەم بەرن ئیبلیس کیبری نواند و ڕەفزی کرد خۆی پێ باشتر بوو بۆیە سوجدەی نەبرد و گوتی من لە ئاگرم و ئەو لە قوڕە، من باشترم و نابێت

کەسێك کە زۆر باش بێت ملکەچ بێت بۆ کەسێك لە خواری خۆی، (قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ) (الاعراف: ١٢).

کەواتە ئەمە یەکەم ڕەخنە بوو لە الله ی گرت سبحانه وتعالی یەکەم کەس بوو قیاسێکی هەڵەی کرد بەرامبەر الله عز وجل.

جا ئەمانە ئیمانیان بە ئەمر و نەهی و عیلم و نووسینەوە و قەدەر هەیە بەڵام دەڵێن ئەمری الله قەدەری هەڵدەوەشێنێتەوە یان قەدەری الله ئەمری هەڵدەوەشێنێتەوە، تانە لە الله دەدەن سبحانه وتعالی، ئەمانە موناقەشە و دەمەقاڵێ لەگەڵ الله دا دەکەن سبحانه وتعالی.

کەواتە ئیمان بە قەدەر ئیمان بوونە بە شەش بنچینەکەی تری ئیمان، ئیمانی بەندە دانامەزرێ بە بنچینەکانی تر تاکو ئیمان بە قەدەر نەهێنێت بە خێر و بە شەڕیەوە، ئەگەر ئیمانت بە الله هەبێت و ئیمانت بە قەدەر نەبێت ئەوا ئیمانت بە الله دانامەزرێت. هەرکەس ئیمانی بە قەدەر نەبێت ئیماندار نییە والعیاذ بالله دەبێ هۆشیار بین.

**باوەڕ بوون بە قەدەر چەندین بەرهەمی گەورەی هەیە ، لەوانە:**

**یەکەم:** پشت بەستن بە الله تعالی لەکاتی ئەنجامدانی هۆکارەکاندا ، بەشێوەیەك کە پشت نەبەسترێت بە خوودی هۆکارەکە خۆیەوە ، چونکە هەموو شتێك بە قەدەری الله تعالی دەبێت.

**دووەم:** کەوا مرۆڤ سەرسام نەبێت بەخۆیەوە لەکاتی بەدیهاتنی مەبەستەکەیدا، چونکە بەدیهاتنی مەبەستەکەی نیعمەتێکە لە لایەن الله تعالی بەوەی کە ڕێکیخستووە و دایناوە لە هۆکارەکانی چاکە و سەرکەوتن ، بەڵام سەرسام بوونی بەخۆیەوە شوکر و سوپاسی ئەم نیعمەتەی لە بیر دەباتەوە.

**سێیەم:** ئارامی و ئیسراحەتی دەروونی بەوەی کە دێت بەسەریدا لە قەدەرەکانی الله تعالی ، جا بێزار و شپرز نابێت بە لەدەست چوونی خۆشویستراوێك یان بە ڕوودانی نەخواستراوێك ، چونکە ئەمە بە قەدەری الله دەبێت کە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە ، وە ئەوە دەبێت ببێت و هیچ ڕێگاچارەیەك نییە بۆ ڕوونەدانی ، وە سەبارەت بەمە الله تعالی فەرموویەتی: (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي

الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ) (لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ) (الحديد: ٢٢،٢٣)

واته : هیچ بەڵایەك ڕوونادات لە زەویدا و لە خوودی خۆیشتاندا ئیللا لە کتێبی (لوح الـمحفوظ) دا نووسراوەتەوە پێش ئەوەی دروستی بکەین ، بەڕاستی ئەمە بە لای الله وە ئاسانە بۆ ئەوەی خەم نەخۆن بۆ ئەوەی کە لە دەستتان دەچێت و دڵخۆشیش نەبن بەوەی کە پێتان دراوە ، وە الله هیچ خۆ بە گەورەزان و شانازیکەرێکی خۆش ناوێت.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ)) صحيح مسلم.

واته : سەرسوڕمان بۆ باری باوەڕدار بەڕاستی هەموو بارێکی خێرە ، وە ئەمەش بۆ کەس نییە تەنها بۆ باوەڕدار نەبێت ، ئەگەر خۆشییەکی تووش ببێت سوپاسی الله دەکات ئەمەش خێرە بۆی ، وە ئەگەر زیانێکی تووش ببێت ئارام دەگرێت ئەمەش خێرە بۆی .

* وخير هذه الأمة بعد نبيها (عليه الصلاة والسلام) أبو بكر الصديق ثم عمر بن الخطاب، ثم عثمان بن عفان، ثم علي بن أبي طالب (رضي اللّٰه عنهم)، وهم الخلفاء الراشدون المهديون *

هەروەها باشترین کەسی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) أبو بکر ـی الصدیق ـە، پاشان عمر ـی کوڕی الخطاب، پاشان عثمان ـی کوڕی عفان، پاشان علی کوڕی أبي طالب (الله لێیان ڕازی بێت)، وە ئەوانە خەلیفەی ڕێنمویی کراو و هیدایەت دراو بوون.

## فەزڵی ابوبکری صدیق (رضي الله عنه) لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم):

**یەکەم:** { عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: (عَبْدٌ خَيَّرَهُ اللَّهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ زَهْرَةَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَهُ). فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) وَبَكَى، فَقَالَ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هُوَ الْمُخَيَّرُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَنَا بِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي مَالِهِ وَصُحْبَتِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ

خَلِيلًا، وَلَكِنْ أُخُوَّةُ الْإِسْلَامِ، لَا تُبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ خَوْخَةٌ إِلَّا خَوْخَةَ أَبِي بَكْرٍ }. [بخاري / فضائل الصحابة /٣٦٩١]

واته: له (أبى سعيد الخدري) ەوە (الله لێی ڕازی بێت) كه پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشت لەسەر دوانگه و فەرمووی: (بەندەیەك الله سەرپشكی كردووه له نێوان جوانی دنیا و ژیانی لای پەروەردگار، ئەو ئەوەی هەڵبژاردووه كه لای پەروەردگاره). أبو بكر (الله لێی ڕازی بێت) گریا و گوتی: باوك و دایكم فیدات بێت، گوتی: سەرپشك كراوەكه پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم) (أبو بكر) یش زاناترین كەسمان بوو بەو فەرمووده، هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (منەتكارترین كەس لەسەر من به ماڵی و به هاوڕێیەتی (أبو بكر)ـه، ئەگەر من خۆشەویستم هەڵبژاردایه أبوبكرم هەڵدەبژارد، بەڵام برایەتی ئیسلام لەنێوانماندایه، هیچ دەرگا چكۆلەیەك بۆ سەر مزگەوت ناهێڵرێت جگه له دەرگا چكۆڵەكەی أبوبكر). خۆشەویستترین كەس لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) أبوبكره (رضي الله عنه).

**دووەم:** { عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ. فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: (عَائِشَةُ).

قُلْتُ :مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: (أَبُوهَا). قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (ثم عُمَرُ) فَعَدَّ رِجَالًا } [بخاري / فضائل الصحابة /٣٤٦٢]

واته: (له أبي عثمان) ەوە دەڵێ: (عمروی كوڕی عاص) (الله لێی ڕازی بێت) هەواڵی دامێ كه پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ فەرماندەیی سوپای (ذات السلاسل)، هاتمه خزمەتی وتم : كێ زۆر خۆشەویسته لات؟ فەرمووی (عائشه) وتم: له پیاوان فەرمووی: (باوكی عائشه) **[واته ابوبكری صديق]** وتم: دوای ئەو كێ؟ فەرمووی: (عمر) چەند پیاوێكی ژمارد.

**سێیەم:** { عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قالَ: وُضِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) عَلَى سَرِيرِهِ، فَتَكَنَّفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُثْنُونَ وَيُصَلُّونَ عَلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، قَالَ: فَلَمْ يَرُعْنِي إِلَّا بِرَجُلٍ قَدْ أَخَذَ بِمَنْكِبِي مِنْ وَرَائِي، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه)، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ وَقَالَ: مَا خَلَّفْتَ أَحَدًا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللَّهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ، وَايْمُ اللَّهِ إِنْ كُنْتُ لَأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَذَاكَ أَنِّي كُنْتُ أُكَثِّرُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: (جِئْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَإِنْ كُنْتُ لَأَرْجُو - أَوْ: لَأَظُنُّ - أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَهُمَا } [بخاري / فضائل الصحابة /٣٤٧٤]

واته: له (إبن عباس) ەوە (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: (عمری كوڕی خطاب) (الله لێی ڕازی بێت) دانرابوو لەسەر دارتەرمەكەی، خەڵك

دەورەیان داو بۆی دەپاڕانەوە و، چاکەیان دەوت و، نویژیان لەسەر دەکرد، پێش ئەوەی هەڵگیرێت، منیش لەناویاندا بووم پیاوێك لە پشتەوە شانی گرتم و ڕایچڵەکاندم، کە لامکردەوە علی بوو (الله لێی ڕازی بێت) ڕەحمەتبوونی (عمر) ی کرد و وتی: هیچ کەست دوای خۆت بەجێ نەهێلاوە کە من حەز بکەم لەسەر وێنەی کردەوەی ئەو بگەم بە خزمەت الله زیاتر لەتۆ. سوێندم بەالله من وامدەزانی کە الله لەگەڵ دوو هاوڕێکەت داتدەنێ، چونکە زۆر جار دەمبیست لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (من و أبوبكر و عمر هاتین، من و أبوبكر و عمر چووینە ژوورەوە، من و أبوبكر و عمر دەرچووین، بەڕاستی من ڕجام وەهابوو، یان وامدەزانی الله بتخاتە لای ئەوان).

**چوارەم:** { عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ (رضي الله عنه) أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَيْئًا، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ فَلَمْ أَجِدْكَ. قَالَ أَبِي: كَأَنَّهَا تَعْنِي الْمَوْتَ. قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ } [بخاري / فضائل الصحابة /٣٤٥٩]

واتە: لە (محمدی کوڕی جبیری کوڕی مطعم) ەوە ئەویش لە باوکییەوە (الله لێی ڕازی بێت): کە ئافرەتێك داوای شتێکی کرد لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە

وتی: یا رسول الله ئەگەر هاتم و تۆم دەستنەکەوت - وەك ئەوەی مەبەستی مردن بێت - فەرمووی: (ئەگەر منت دەستگیر نەبوو وەرە بۆ لای أبو بکر).

## فەزڵی عمری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم):

**یەکەم:** { عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ، فَإِذَا امْرَأَةٌ تَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ لِمَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا :لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ .فَذَكَرْتُ غَيْرَةَ عُمَرَ فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ :فَبَكَى عُمَرُ وَنَحْنُ جَمِيعًا فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، ثُمَّ قَالَ: عُمَرُ بِأَبِي أَنْتَ وَأمي يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعَلَيْكَ أَغَارُ؟ [بخاري / بدء الخلق / ٣٠٧٠]

واتە: لە أبی هریرەوە (الله لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لەکاتێکدا من خەوتبووم خۆم لەبەهەشتدا دی، ئافرەتێکم دی لە پەنا کۆشکێکدا دەستنوێژی دەگرت، وتم: ئەم کۆشك و ئافرەتە هی کێیە؟ وتیان: هی (عمری کوڕی خطاب)ە، غیرەتی (عمر) م یادکەوتەوە بۆیە خێرا پشتم هەڵکرد). أبو هریرە دەڵێ: عمر گریا، ئێمەش گشتمان گریاین لەو مەجلیسەدا لەگەڵ

پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئینجا عمر وتی: دایك و باوكم فیدات بێ - یا رسول الله - من بەرانبەر تۆ غیرەت بمگرێ و بەدگومان بم ؟.

**دووەم:** { عن أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي عَلَى قَلِيبٍ عَلَيْهَا دَلْوٌ، فَنَزَعْتُ مِنْهَا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ فَنَزَعَ بِهَا ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وَفِي نَزْعِهِ - وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ - ضَعْفٌ، ثُمَّ اسْتَحَالَتْ غَرْبًا، فَأَخَذَهَا ابْنُ الْخَطَّابِ، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ } [بخاري / فضائل الصحابة /٣٤٦٤]

واتە: لە ابی هریرەوە (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو: (لەكاتێكدا خەوتبووم خۆم دی بەسەر بیرێكەوە دولچەیەكی لەسەر بوو، ئەوەندەی الله ویستی ئاوم لێهەڵگۆزی، لەپاشدا كوڕەكەی (أبو قحافە) دۆڵچەكەی وەرگرت دۆڵچەیێ دوو دۆڵچە ئاوی هەڵگۆزی، لە هەڵگۆزینەكەشیدا - الله لێی ببورێ - لاواز بوو، لەپاشدا دۆڵچەكە بوو بە دۆڵچەیەكی گەورە (عمری كوڕی خطاب) وەریگرت هیچ ئازایی و لێزانیەكم لە ئادەمیزاد نەدیوە بە وێنەی (عمر) ئاو هەڵبكێشێ، هەتا ئەوەندەی هەڵكێشا خەڵك وشترەكانیان پاراو كرد و بردیانن بۆ مۆڵگا).

**سێیەم:** { عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: (قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ). قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: تَفْسِيرُ مُحَدَّثُونَ: مُلْهَمُونَ } [بخارى / فضائل الصحابة /٣٤٨٦]

واته: له عائشەوه (الله لێی ڕازی بێت) له پێغەمبەرەوه (صلى الله عليه وسلم) كه فەرموویەتی: (ئوممەتەكانی بەر له ئێوه وابوون كەسانی بەهرەمەند **(مُلهَم)** یان هەبووه، ئەگەر له ئوممەتی من یەكێ لەوان هەبێ ئەوه (عمری كوڕی خطاب) لەوانه).

**چوارەم:** { عن سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضي الله عنه) قَالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَعِنْدَهُ نِسَاءٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُكَلِّمْنَهُ وَيَسْتَكْثِرْنَهُ، عَالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ، فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ قُمْنَ يَبْتَدِرْنَ الْحِجَابَ، فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَضْحَكُ، فَقَالَ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (عَجِبْتُ مِنْ هَؤُلَاءِ اللَّاتِي كُنَّ عِنْدِي، فَلَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ ابْتَدَرْنَ الْحِجَابَ). قَالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يَهَبْنَ. ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: أَيْ عَدُوَّاتِ أَنْفُسِهِنَّ، أَتَهَبْنَنِي وَلَا تَهَبْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قُلْنَ: نَعَمْ، أَنْتَ أَغْلَظُ وَأَفَظُّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (وَالَّذِي نَفْسِي

بِيَدِهِ، مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكًا فَجًّا إِلَّا سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ }.

[بخاري / بدء الخلق / ٣١٢٠]

واته: سعدی کوڕی أبي وقاص (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: عمر داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەکاتێکدا کە کۆمەڵێ ئافرەتی لابوو قسەیان لەگەڵ دەکرد و، داوای ئامۆژگاری زیاتریان دەکرد، دەنگیان هەڵبڕیبوو کاتێ عمر ڕێگای خواست هەستان و خێرا عەباکانیان پێچا بەخۆیانەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەدەم پێکەنینەوە ڕێگای عمری دا، عمر فەرمووی: الله دانەکانت بخاتە خەنین ئەی پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: (سەرم لەم ئافرەتانە سوڕما کە لای من دانیشتبوون لەکاتێکدا دەنگی تۆیان بیست خێرا عەباکانیان پێچا لەخۆیانەوە)، عمر وتی: هەقیان وایە لە تۆ زیاتر بترسن. لەپاشدا عمر بە ئافرەتەکانی وت: ئەی ئافرەتانێك کە دوژمنی خۆتانن لە من دەترسن و لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناترسن؟ وتیان: بەڵێ، تۆ ڕەقتری و وشك تری لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هیچ کات شەیتان بە تۆ نەگەیشتووە لەسەر ڕێگایەکدا مەگەر ئەو ڕێگایەکی تری گرتووە. (واتە: ڕێگای خۆی گۆڕیووە).

**فەزڵی عثمانی کوڕی عفان (رضي الله عنه) لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم):**

**یەکەم:** { عن عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُضْطَجِعًا فِي بَيْتِي، كَاشِفًا عَنْ فَخِذَيْهِ أَوْ سَاقَيْهِ، فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ (رضي الله عنه) فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ (رضي الله عنه) فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَسَوَّى ثِيَابَهُ - قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلَا أَقُولُ ذَلِكَ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ - فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَتْ عَائِشَةُ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ، فَقَالَ: (أَلَا أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلَائِكَةُ }. [صحيح مسلم الصفحة أو الرقم: 2401]

واته: عائشە (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (لە ماڵەوە ڕاکشا بوو، هەردوو ڕانی، یان هەردوو قوڵی دەرخستبوو، أبوبكر (الله لێی ڕازی بێت) مۆڵەتی خواست، مۆڵەتی داو لەسەر ئەو حاڵە ماوە، أبوبكر گفتوگۆی لەگەڵ کرد، دوای ئەو عمر (الله لێی ڕازی بێت) مۆڵەتی خواست، ڕێگەی داو هەر بەو شێوە مایەوە و گفتوگۆی لەگەڵ ئەویش کرد، لەپاشدا عثمان (الله لێی ڕازی بێت) مۆڵەتی خواست، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشت

جله‌كانی ڕێك و پێك كرد، محمدی كوڕی حرمله ده‌ڵێ: ناڵێم ئه‌مه هه‌مووی له یه‌ك ڕۆژدا بوو، عثمان هاته ژوور و قسه‌ی له‌گه‌ڵ كرد، له كاتێكدا ده‌رچوو ، عائشه وتی كه أبوبكر هاته ژوور بۆی نه‌جوڵایت و گوێت پێ نه‌دا، له‌پاشدا عمر هات و بۆی نه‌جوڵایت و گوێت پێ نه‌دا. له‌پاشدا عثمان هاته ژوور دانیشتی و جله‌كانت ڕێك و پێك كرد، فه‌رمووی: ئایا شه‌رم نه‌كه‌م له كه‌سێك كه فریشته‌كان شه‌رمی لێده‌كه‌ن ؟.

**دووه‌م:** { عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ (رضي الله عنه): (أَنَّهُ تَوَضَّأَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: لَأَلْزَمَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَلَأَكُونَنَّ مَعَهُ يَوْمِي هَذَا. قَالَ: فَجَاءَ الْمَسْجِدَ، فَسَأَلَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالُوا: خَرَجَ وَجَّهَ هَاهُنَا، قَالَ: فَخَرَجْتُ عَلَى أَثَرِهِ أَسْأَلُ عَنْهُ حَتَّى دَخَلَ بِئْرَ أَرِيسٍ، قَالَ: فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، وَبَابُهَا مِنْ جَرِيدٍ، حَتَّى قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَاجَتَهُ وَتَوَضَّأَ، فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ جَلَسَ عَلَى بِئْرِ أَرِيسٍ وَتَوَسَّطَ قُفَّهَا، وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلَّاهُمَا فِي الْبِئْرِ، قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، فَقُلْتُ: لَأَكُونَنَّ بَوَّابَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْيَوْمَ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) فَدَفَعَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، قَالَ: نعم، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: (ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ).

قَالَ: فَأَقْبَلْتُ حَتَّى قُلْتُ لِأَبِي بَكْرٍ: ادْخُلْ وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُبَشِّرُكَ بِالْجَنَّةِ. قَالَ: فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَجَلَسَ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَعَهُ فِي الْقُفِّ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ، كَمَا صَنَعَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ. ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، وَقَدْ تَرَكْتُ أَخِي يَتَوَضَّأُ وَيَلْحَقُنِي، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللَّهُ بِفُلَانٍ - يُرِيدُ أَخَاهُ -خَيْرًا يَأْتِ بِهِ، فَإِذَا إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ. فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، وَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: (ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ). فَجِئْتُ عُمَرَ (رضي الله عنه) فَقُلْتُ: أَذِنَ وَيُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْجَنَّةِ، قَالَ: فَدَخَلَ فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْقُفِّ عَنْ يَسَارِهِ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ .ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ إِنْ يُرِدِ اللَّهُ بِفُلَانٍ خَيْرًا - يَعْنِي أَخَاهُ - يَأْتِ بِهِ، فَجَاءَ إِنْسَانٌ فَحَرَّكَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، قَالَ: وَجِئْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، مَعَ بَلْوَى تُصِيبُهُ). قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: ادْخُلْ، وَيُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْجَنَّةِ مَعَ بَلْوَى تُصِيبُكَ، قَالَ: فَدَخَلَ فَوَجَدَ الْقُفَّ قَدْ مُلِئَ، فَجَلَسَ وِجَاهَهُمْ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ. قَالَ شَرِيكٌ: فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ : فَأَوَّلْتُهَا قُبُورَهُمْ }. [بخاري / فضائل الصحابة /٣٤٧١]

واته: سعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێ: أبو موسى الاشعري (الله لێی ڕازی بێت) هەواڵی دامێ کە لە ماڵی خۆیان دەستنوێژی گرت و،

پاشان دەرچوو وتی: دەبێ ئەمڕۆ لە خزمەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) ببم و لێی جیا نەبمەوە، دەڵێ: هاتە مزگەوت و پرسیاری کرد وتیان: دەرچووە و ئاوا ڕووی ناوە، دەڵێ: بەدوایدا ڕۆیشتم پرسیارم دەکرد هەتا گەیشتە بیری (أریس) لای دەرگاکەیدا دانیشتم، دەرگاکەیشی لە لقی دارخورما تەنرابوو، هەتا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی سەراوی بەجێ هێنا و دەستنوێژی گرت، ئینجا هەستام چووم بۆ لای لەسەر بیرەکە دانیشتبوو لە ناوەڕاستی سەکۆی بیرەکەدا و هەردوو قولی ڕووتکردبوو شۆڕی کردبوونەوە ناو بیرەکە، سەلامم لێکرد و، دوایی ڕۆیشتم و لای دەرگاکە دانیشتم و وتم دەبێ ئەمڕۆ دەرگاوانی پێغەمبەر بم (صلی الله علیه وسلم)، ابو بکر (الله لێی ڕازی بێت) هات پاڵی نا بە دەرگاکەوە وتم: کێیە؟ وتی: ابوبکرم وتم: پەلە مەکە، وتی: بەڵێ ، پاشان ڕۆیشتم وتم: یا رسول الله ئەوە أبوبکرە، داوای مۆڵەت دەکات؟ فەرمووی: مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتیشی بدەرێ، هاتمەوە بە ابوبکرم وت: وەرە ژوورەوە لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موژدەی بەهەشتت دەداتێ. دەڵێ: أبوبکر هاتە ژوورەوە لای ڕاستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپەنا ئەودا هەر لەسەر سەکۆکە دانیشت و، قاچەکانی شۆڕ کردەوە ناو بیرەکە و، بە وێنەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قولی ڕووتکرد. دیسان گەڕامەوە دانیشتم، کاتێ من لەماڵ هاتم براکەم جێهێشت دەستنوێژ

بگرێت و بەدوامدا بێت، بۆیە وتم: ئەگەر الله ویستی چاکەی بە فلان بێ (مەبەستی براکەی بوو) دەیهێنێ بۆ ئێرە، لەناکاو یەکێك دەرگاکەی جولآن، وتم ئەوە کێیە؟ وتی: عمری کوڕی خطاب ـە، وتم: پەلە مەکە، لەپاشدا چووم بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەلامم لێکرد و وتم: ئەوە عمرە داوای مۆڵەت دەکات؟ فەرمووی: (مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی بدەرێ) هاتمەوە لای عمر وتم: پێغەمبەر مۆڵەتی دایت و موژدەی بەهەشتیشت دەداتێ. دەڵێ: هاتە ژوور دانیشت لەگەڵ پێغەمبەر لەسەر سەکۆکە و لەلای چەپیەوە و، هەردوو قاچی شۆڕکردەوە ناو بیرەکە. دیسان هاتمەوە دانیشتم وتم: ئەگەر الله ویستی چاکەی بە فلان هەبێت دەیهێنێ بۆ ئێرە - مەبەستی براکەی بوو - یەکێ هات دەرگاکەی جولآند، وتم: ئەوە کێیە؟ وتی: عثمانی کوڕی عفان، وتم: پەلە مەکە، هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەواڵم دایێ، فەرمووی: (مۆڵەتی بدە و، موژدەی بەهەشتی بدەرێ لەگەڵ بەڵایەکدا تووشی دەبێ) هاتم وتم: وەرە ژوورەوە و پێغەمبەریش موژدەی بەهەشتت دەداتێ لەگەڵ بەڵایەکدا کە توشت دێ. دەڵێ: هاتە ژوورەوە سەر سەکۆکە جێگە نەمابوو، لەو بەرەوە بەرانبەر ئەوان دانیشت. (شریك)ی ڕاوی دەڵێ: سعیدی کوڕی (مسیب) وتی: وام مانا کرد کە ئەوە گۆڕەکانیانە.

## فەزڵی علی کوڕی ابو طالب (رضي الله عنه) له فەرموودەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم):

**یەکەم:** { عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضي الله عنه) قَالَ: خَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُخَلِّفُنِي فِي النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ؟ فَقَالَ: (أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، غَيْرَ أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي). [بخاري / المغازي /٤١٥٤]

واته: سعدی کوڕی أبی وقاص (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ جەنگی (تبوك) (علی کوڕی أبو طالب)ی کرد بە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە، وتی: یا رسول الله جێم دێڵی لەگەڵ ژن و منداڵدا ؟ فەرمووی: (ئایا ڕازی نابیت تۆ بۆ من وەك هارون بیت بۆ موسی، ئەوەندە هەیە دوای من پێغەمبەر نایەت).

**دووەم:** { عن سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: (لَأُعْطِيَنَّ هَذِهِ الرَّايَةَ رَجُلًا يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ، يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ). قَالَ: فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا، قَالَ: فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كُلُّهُمْ يَرْجُونَ أَنْ

يُعْطَاهَا، فَقَالَ: (أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ). فَقَالُوا: هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ. قَالَ: (فَأَرْسِلُوا إِلَيْهِ). فَأُتِيَ بِهِ، فَبَصَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ، فَبَرَأَ حَتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ، فَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ، فَقَالَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه): يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا؟ فَقَالَ: (انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللَّهِ فِيهِ، فَوَاللَّهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلًا وَاحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ) }. [بخاري / الجهاد /٣٧٨٣]

واته: سهلى كوڕى سعد (الله لێى ڕازى بێت) دەڵێ: پێغەمبەرى الله (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژى خەیبەر فەرمووى: (ئەم ئاڵایە دەدەمە دەستى پیاوێك الله لەسەر دەستى ئەو سەركەوتن ئەنجام دەدات، الله و پێغەمبەرى خۆشدەوێت و، الله و پێغەمبەریش خۆشیان دەوێت. دەڵێ: خەڵك ئەو شەوەیان كردەوە بەو باسەوە: دەبێ كامیان ئەو ئاڵایەى بدرێتێ، كاتێ خەڵك ڕۆژیان لێبوویەوە، بەیانى زوو ڕۆیشتن بۆ خزمەتى پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموویان خوازیارى ئەوە بوون ئەو ئاڵایەیان بدرێتێ، فەرمووى: (على كوڕى أبو طالب لە كوێیە ؟). وتیان: ئەى پێغەمبەرى الله ئەو لەدەست ئازارى هەردوو چاوى دەناڵێنێ. فەرمووى: (بنێرن بە دوایدا) هێنایان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تفى كردە هەردوو چاوى و بۆى پاڕایەوە، چاك بوو هەروەك ئازارى نەبووبێت، ئاڵاكەى دایە دەستى، على (الله لێى ڕازى

بێت) وتی: یا رسول الله لەگەڵیان نەجەنگین تا وەك ئێمەیان لێدێت؟ فەرمووی: (لەسەرخۆ بڕۆ ناویان تا دەگەیتە قەراغی ماڵەکانیان، دوایی بانگیان بکە بۆ ئیسلام هەواڵیان بدەرێ بەوەی واجبە لەسەریان لە ئەرکی الله، سوێند بە الله، ئەگەر الله بەهۆی تۆوە یەك کەس ڕێنمایی بکات بۆ تۆ چاکترە لە هەرچی وشتری سوور هەیە).

**{** مەبەست سامانی دنیایە **}**.

* وأن العشرة الذين سماهم رسول (الله صلى الله عليه وسلم) وشهد لهم بالجنة ونشهد لهم على ما شهد به رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وقوله الحق *

بەڕاستی ئەو (١٠) کەسەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی هێناون وە شایەتی بۆ داون بە بەهەشت، شایەتیان بۆ دەدەین لەسەر ئەوەی کە شایەتی پێ دراوە لەلایەن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە وتەکەی حەقە.

نص الرسول - صلى الله عليه وسلم - نصاً صريحاً على أن عشرة من أصحابه من أهل الجنة، ففي (مسند أحمد)، و (سنن الترمذي) عن عبدالرحمن بن عوف عن النبي - صلى الله عليه وسلم – قال: ((أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة في الجنة، والزبير في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة، وسعد بن أبي وقاص في الجنة، وسعيد بن زيد في الجنة، وأبو عبيدة بن الجراح في الجنة)). وإسناده صحيح، وروى الحديث الإمام أحمد وأبو داود وابن ماجه. رواه الترمذي (٣٧٤٧)، وأحمد (١٦٧٥) (١/١٩٣) وحسنه ابن حجر في [هداية الرواة - (٥/٤٣٦)] كما ذكر في مقدمته. وقال أحمد شاكر في [مسند أحمد: (٣/١٣٦) إسناده صحيح.

واتە: ابوبکری صدیق بۆ بەهەشتە، عومەری کوڕی خطاب بۆ بەهەشتە، عثمانی کوڕی عفان بۆ بەهەشتە، علی کوڕی ابو طالب بۆ بەهەشتە، طلحە بۆ بەهەشتە، زوبیر بۆ بەهەشتە، عبدالرحمن ـی کوڕی عوف بۆ بەهەشتە، سعدی کوڕی ابی وقاص بۆ بەهەشتە، سعیدی کوڕی زید بۆ بەهەشتە، ابو عبیدەی کوڕی جراح بۆ بەهەشتە.

## * والترحم على جميع أصحاب محمد (صلى الله عليه وسلم)، والكف عما شجر بينهم *

هەروەها ڕەحمەت ناردن بۆ سەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وە دەست گرتنەوە و بێدەنگ بوون لەو شتانەی لەنێوانیاندا ڕوویداوە.

هەروەکو الله تعالى لە قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ) (الحشر: ١٠)

واتە: (والذين جاءوا من بعدهم يقولون) ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون، واتە: پاش کۆچکەران (مهاجرين) و یارمەتیدەرانەوە (انصار) هاتوون ، دەڵێن: (ربنا اغفر لنا ولإخواننا الذين سبقونا بالإيمان) ئەی پەروەردگارمان ! لە ئێمە و لەو برایانەمان کە پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆشببە (ولا تجعل فى قلوبنا غلا للذين آمنوا) و، هیچ بوغز و قینێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە (ربنا إنك رؤوف رحيم) ئەی پەروەردگاری ئێمە ! بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان.

امامی (عومەر) گوێی لە پیاوێك بوو باسی موهاجیرانی بە چاك دەكرد ! ئەویش ئایەتی (للفقراء المهاجرين) ـەی بۆ خوێندەوە و، فەرمووی: ئایا تۆ وەك ئەوان دەبی؟ وتی: نەخێر، پاشان ئایەتی (والذين تبؤوا الدار والإيمان) ـەی بەسەردا خوێندەوە و فەرمووی: ئەی وەك ئەو دەستە دەبیت ؟ كابرا وتی: نەخێر، پاشان ئایەتی (١٠)ی سورەتی الحشر ی (والذين جاءوا من بعدهم يقولون) بۆ خوێندەوە و فەرمووی: ئەی لەمانەیت ؟ كابرا وتی: بەتەمام لەمانە بم. پێشەوا (عومەر) فەرمووی: دە چاك بزانە هەركەسێك بەباشی ناویان نەبا و، بگرە لەباتی ئەوە جنێویان پێبدات، با چاك بزانێت لە هیچ كام لەو ئیماندارانە نییە. واتە: لە هەرسێ تاقمەكە بێ بەشە. بێجگە لەوەش پێشەوا (ماليك) دەڵێت: ئەو كەسەی جوێن بە هاوەڵان دەدات كافرە و لە (فيئ)یش بەش نابات. " تەفسیری ڕامان "

هەروەها باس لە هیچ شتێك ناكەین كە لەنێوانیاندا ڕوویداوە، چونكە الله تعالى لێیان ڕازی بووە، هەروەكو لە قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت:

(رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) (البينة: ٨)

واتە: (رضى الله عنهم) الله لێیان ڕازی و خۆشنوودە بەهۆی كارە چاكەكانیانەوە، (ورضوا عنه) جا ئەوانیش لەو ڕازی و، خۆشنوودن سەبارەت بەو هەموو بەخششەی پێیداون.

هەروەها الله عز وجل دەفەرموویت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) (التوبة: ١٠٠)

واتە: (والسابقون الأولون من المهاجرين والأنصار) لە دەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان (والذين اتبعوهم بإحسان) و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش (رضی الله عنهم) الله ڕازی بوو لێیان (ورضوا عنه) و ئەوانیش لە الله ڕازی بوون. لە چەند جێگایەکی تردا ئەو فەزڵ و ڕێزو حورمەتە هاتووە ، بۆ نموونە: لە سورەتی (٣/٦٣) دا دەفەرموویت: ( وآخرين منهم لما يلحقوا بهم ... ) یان لە سورەتی (١٠/٥٩) دا دەفەرموویت: (والذين جاؤوا من بعدهم يقولون ربنا اغفر لنا ولإخواننا ... ) ، یان لە سورەتی (٧٥/٨) دا دەفەرموویت: (والذين آمنوا من بعد وهاجروا وجاهدوا معكم فأولئك منكم ... ) بێ لەمەش ئەوەمان دەست دەخەن کە: (تابیعین) و پاشینانی ئەوانە، وەك پێشینانیان حیسابیان بۆ دەکرێ و، ڕەزامەندی الله بەدەست دێنن (وأعد لهم جنات تجری تحتها الأنهار) بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەر درەخت و کۆشکەکانییدا ڕووبار گەلێ دەچێت (خالدين فيها أبدا) بە هەتا هەتاییش تێیدا دەمێننەوە (ذلك الفوز العظيم) هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازی گەورە و بە نرخ.

(سەعیدی کوڕی موسەیەب) و دەستەیەکی تر لە پێناسەی (سابقین) دا دەڵێن: **(هم الذین صلوا الی القبلتین)**. ئەوانە بوون کە لە نوێژەکەدا ڕوویان لە هەردوو قیبلەکە کرد. ئیمامی شافیعی و یارانیشی دەڵێن: **(هم الذین شهدوا بیعة الرضوان)**. ئەوانە بوون لە (بەیعەتی ریزوان) دا ئامادەبوون، دەسا واوەیلا و ئۆف بۆ ئەوانەی رقیان لەو کەسانەیە کە الله ڕازییە لێیان و ئەوانیش لە الله ڕازین ! بێ لەوەیش هێشتا جنێویان دەدەنێ و تەکفیریان دەکەن !!.

## * وأن الله عز وجل على عرشه بائن من خلقه، كما وصف نفسه في كتابه، وعلى لسان رسوله (صلى الله عليه وسلم)، بلا كيف *

الله تعالى لەسەر عەڕشە و جیایە لە دروست كراوەكانی، هەروەك چۆن خۆی وەسفی كردووە لە قورئاندا، هەروەها لەسەر زمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەبێ چۆنییەتی.

الله تعالى لەسەر عەرشە لەسەرووی هەموو ئاسمانەكانەوە، هەروەكو الله تبارك وتعالى دەفەرموویت: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى) (طه: ٥)

واتە: خوای گەورە لەسەر عەرش بەرز و بڵند بۆتەوە، بەو شێوەی شیاوی بێت، ئێمە چۆنیەتییەكەی نازانین.

دیارە الله خۆی چۆنی مەبەست بێت، ئێمەش هەر بەو جۆرە باوەڕمان پێی هەیە، هەروەك (سەلەف)یش دەڵێن: وەكو ئیمامی (مالیك، ئەوزاعی، سەوری، لەیس، شافیعی، ئەحمەد، ئیسحاق) كە بەبێ چۆنیەتی و، شوبهاندن و، لە كارخستنی سیفەتەكان بەسەریاندا بچین.

(نوعەیمی كوڕی حماد)ی "مامۆستای بوخاری" دەڵێ: (من شبه الله بخلقه فقد كفر، و من جحد ما وصف الله به نفسه فقد كفر، وليس فيما وصف به نفسه ولا رسوله تشبيه).

لە (ئیبن قەییم) دەپرسن: ئەگەر دوو کەس لە پەیڕەوانی شافیعی بکەونە چەلەحانێ لەگەڵ یەکتر، ئەوجا یەکێکیان بڵێ: هەرکەسێ پێی وانەبێ الله لە ئاسمانە، سەرلێشێواو و سەر لێ تێکچووە، ئەوی دیکەش بڵێ: نەخێر ! الله بێ جێ و مەکانە، ئایا ئەم دوو بۆچوونە کامیان لەسەر عەقیدەی ئیمامی شافیعییە ؟ لە وەڵامدا وتی: عەقیدەی شافیعی و، عەقیدەی پێشینەکانی ئیسلام، وەك ئیمامی (مالیك، سەوری، ئەوزاعی، ئیبن موبارەك، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاق) هەر وەکو عەقیدەی زانا بەرێزەکانی ترە، وەك (فوزەیلی کوڕی عیاض، ئەبو سولەیمانی دارانی، سەهلی کوڕی عبدالله ی تەسەتتوری) چونکە لە نێوان هیچ لایەك لەو بەرێزانە و وێنەیاندا، هیچ ناکۆکی و جیاوازی لە بەرامبەر بنەماکانی ئاییندا نەبووە. ئەوەتە پێشەوا شافیعی لە سەرەتای کتێبی (الرسالة)دا دەڵێ: (الحمد لله الذی .. هو کما وصف به نفسه و فوق ما یصفه به خلقه). (ئیبن کەسیر) لە کتێبی (البدایه والنهایه) دا دەڵێ: ڕەبیعی مامۆستای شافیعی و پیاوە هەڵکەوتووەکانی مەزهەبی شافیعی، بەبێ باسکردنی هیچ چۆنایەتییەك سیفەتەکانی الله دەسەلمێنن.

جا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ((إن الله كتب كتابا قبل أن يخلق الخلق فهو مكتوب عنده فوق العرش)) [صحيح البخاري ومسلم].

واتە: اللە تعالی نوسراوێکی نوسیوە پێش ئەوەی دروستکراوەکان دروست بکات، ئەو نوسراوە لای خۆیەتی لەسەر عەرش.

لە یەمەن پارچە زێڕێکیان نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ دابەشی کرد بەسەر چوار کەسدا بۆ ئەوەی دڵیان بۆ دینی ئیسلام ڕابکێشێت، پاشان نەفەرێك ڕاست بووەوە، وتی: ئەی پێغەمبەر ئێمە شایستەترین بیدە بە ئێمە بۆ دەیدەی بەو چوار کەسە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ألا تأمنوني وأنا أمين من في السماء)) [رواه البخاري، وانظر: صحيح الجامع الصغير: ٢٦٤٥]

واتە: ئایا ئێوە منتان لا ئەمین نییە، لەکاتێکدا من ئەمینداری ئەو زاتەم کە لە ئاسمانە لەسەر عەرش.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە اللە تعالی لەسەر عەرشە بەزاتی خۆی.

**حوکمی ئەو کەسەی نکۆڵی بەرز و بڵندی (علو – ی) اللە دەکات و دەڵێ لەسەر عەرش نیە لە لای سەلەف :**

عبد الملك بن عبد الحميد الميموني دەڵێ : پرسیم لە أبو عبدالله أحمد (امام أحمد) سەبارەت بەوانەی دەڵێن اللە لەسەر عەرش نییە ، گوتی : قسەکانیان هەمووی لەسەر کوفر دەسوڕێتەوە.

السنة للخلال ( ٢٢٥٢ / ١٠١ ).

يزيد بن هارون دەڵێ : هەركەس گومان ببا بە (الرحمن على العرش استوى) جیاواز لەوەی جێگیر بووە لە دڵی هەمووواندا ئەوە جەهمییە.
السنة للخلال ( ٢٢٥٩ ).

المروذي دەڵێ : بیستم محمد بن یحیی بن سعید القطان گوتی : باوکم و عبدالرحمن بن مهدي دەیانگوت : جەهمییەکان لە دەوری ئەوە دەسوڕێنەوە کە ئاسمان هیچ شتێکی لێ نییە (واتە الله لە سەرووی ئاسمانەکانەوە نییە).
الابانة الكبرى كتاب الرد على الجهمية ج ٢ (٢٥٥).

أحمد بن ابراهیم گوتی : یزید بن هارون باسی جەهمییەکانی کرد و گوتی : سوێند بەو الله یەی کە هیچ پەرستراوێك شایەنی پەرستن نییە جگە لەو ئەوانە زەندیقن نەفرەتی الله یان لێ بێت.
الابانة الكبرى كتاب الرد على الجهمية ج٢ (٢٧٥).

سلیمان بن حرب دەڵێ : بیستم حماد بن زید دەیگوت : ئا ئەو جەهمییانە هەوڵ دەدەن بڵێن کە لە سەرووی ئاسمانەوە (هیچ پەروەردگارێك نییە).
الابانة الكبرى كتاب الرد على الجهمية ج٢ (٣٢٩).

عبد الله بن مبارك دەڵێ : ئێمە دەتوانین قسەی گاور و جولەکەکان بگێڕینەوە بەڵام ناتوانین قسەی جەهمییەکان بگێڕینەوە.
الابانة الكبرى كتاب الرد على الجهمية ج٢ (٣٣٤).

سلام بن أبي مطيع دەیگوت : ئا ئەو جەهمییانە کافرن و نوێژیان لە پشتەوە ناکرێ.
الابانة الكبرى كتاب الرد على الجهمية ج٢ (٣٣٦).

أحمد بن ابراهيم گوتی گوێم لە يزيد بن هارون بوو باسی جەهمییەکانی دەکرد گوتی : ئەوانە والله زەندیقن نەفرەتی الله یان لێ بێت.
الابانة الكبرى كتاب الرد على الجهمية ج٢ (٣٣٧).

سعيد بن عامر الضبعي باسی جەهمییەکانی دەکرد دەیگوت : ئەوان خراپترن لە گاور و جولەکەکان ، چونکە بێ گومان گاور و جولەکەکان و خاوەن دینەکان و موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی الله عز وجل لەسەر عەرشە بەڵام ئەوان ووتیان لە سەرووی هیچەوە نییە.
العلو للعلي الغفار للذهبي.

ابن خزيمة دەڵێ : هەرکەس دان نەنێت بەوەدا کە الله لەسەر عەرشەکەیەتی (بەرز بووەتەوە بۆ سەرووی حەوت ئاسمانەکە) ئەوە کافر دەبێت پێی ، داوای تەوبەی لێ دەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد

ئەگەر نا لە گەردنی دەدرێت و لاکەکەی فڕێ دەدرێتە ناو خاشاکگە وە تاوەکو موسڵمانان و ئەوانەی ئەهلی ذیممەن بێزار نەبن بە بۆنەکەی .
کتاب التوحيد لابن خزيمة.

پرسیار کرا لە أبو زرعة سەبارەت بە وتەی الله جل جلاله ( الرحمن على العرش استوى ) ، توڕە بوو پاشان گوتی : تەفسیرەکەی ئەوەیە کە دەیخوێنیتەوە ، ئەو بەرز بووەتەوە بۆ سەر عەرش و زانستەکەی لە هەموو شوێنێکە ، هەرکەسێ جگە لەوە بڵێ نەفرەتی الله ی لێ بێت .
العلو للذهبي (٤٦٥).

وهب بن جرير دەڵێ : جەهمییەکان زەندیقن ئەوان دەیانەوێت تەنها بڵێن ئاسمان هیچ پەروەردگارێکی لێ نییە.
خلق أفعال العباد ل (٣٠).

عثمان بن سعيد الدارمي دەڵێ : هەروەها تەکفیریان دەکەین (واتە جەهمییەکان) لەبەر ئەوەی نازانن الله لەکوێیە وە وەسفی ناکەن بە کوێ (شوێنی بۆ جێگیر ناکەن) ، بەڵام الله خۆی وەسفی خۆی کردووە بە کوێ (شوێنی بۆ خۆی جێگیر کردووە ... جەهمییەکان کافرن بەوە) باوەڕیان پێی نییە ، وە ئەوەش لە ڕوونی کوفریانە.
الرد على الجهمية ل (١٨٣).

سهل بن أبي خدويه پرسیاری کرد له عبدالرحمن بن مهدي دەربارەی قورئان، گوتی : ئەی أبو یحیی ئەوه تۆ چیته لەگەڵ ئەو بابەتانەدا ئەوانه بابەتەکانی هاوەڵانی جەهم ن ، بێ گومان له نێو خاوەن ئارەزووەکاندا تیایاندا نییه خراپتر بن له هاوەڵانی جەهم ، گوتی : لەسەر ئەوه دەسوڕێنەوه که بڵێن : سەرووی ئاسمانەکان هیچی تێدا نییه (واته الله لەسەر عەرش نییه) ، من وا دەبینم هاوسەرگیریان لەگەڵ نەکرێ وه میراتیان لێ نەگیرێ.

السنة لعبد الله بن أحمد (١٣٠).

جرير بن عبد الحميد دەڵێ : سەرەتای قسەی جەهمییەکان هەنگوینه (واته قسەکانیان دەڕازێننەوه) وه کۆتاییەکەی ژەهره ، ئەوان هەوڵ دەدەن بڵێن سەرووی ئاسمان هیچ پەروەردگارێکی لێ نییه.

بيان تلبيس الجهمية (١ / ٢٠٠).

محمد بن يوسف دەڵێ : هەرکەس بڵێ الله لەسەر عەرش نییه کافره.

خلق أفعال العباد للبخاري ل (١٥).

عبدالله بن المبارك دەڵێ : هەموو گەلێك دەزانن چی دەپەرستن تەنها جەهمییەکان نەبێ.

خلق أفعال العباد للبخاري (١٦).

عبدالرحمن بن مهدي دەڵێ : جەهمییەکان ویستیان نەفی ئەوە بکەن کە الله قسەی لەگەڵ موسا کردووە وە لەسەر عەرشە ، وا دەبینم داوای تەوبەیان لێ بکرێت ئەگەر تەوبەیان کرد وە گەر نا بدرێ لە گەردنیان.

خلق أفعال العباد للبخاري.

محمد بن مصعب العابد ٢٢٨هـ مردووە دەڵێ : گەواهی دەدەم کە تۆ (واتە الله) لەسەر عەرشی لە سەرووی حەوت ئاسمانەکە وەکو ئەوە نا کە دوژمنە زەندیقەکانت دەیڵێن.

الصفات للدارقطني (٦٤).

بۆیە تەکفیری هەندێ لە سەلەفم بۆ جەهمییەکان داناوە لەبەرئەوە هەرکەس بڵێ الله لەسەر عەرش نییە جەهمییە لە لایان ، جەهمییەکانیش بە کافر دەزانن ئەوەش چەند نموونەیەکی زۆر زۆر کەم بوو.

## * أحاط بكل شيء علما *

علمەکەی الله تعالی هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

الله تبارك وتعالی دەفەرموویت: (عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ) (الانعام: ٧٣)

واتە: الله تعالی زانای نهێنی و پەنهان و ئاشکراکانە، هەروەها (الله) زۆر کاربەجێیە و زانیارییەکی وردی هەیە بە هەموو شتێك.

هەروەها دەفەرموویت: (ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) (التوبة: ٩٤)

واتە: پاشان دەگەڕێنەوە بۆ لای الله کە زانای نهێنی و ئاشکراکانە و هەموو شتێك دەزانێ و، هەواڵتان پێ دەدات سەبارەت بەو کردەوانەی کە کردووتانە.

جا دەفەرموویت: (عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ) (الرعد: ٩)

واتە: ئەو زاتەیە بە گشت نادیارو دیارێك زانا و ئاگادارە و هەر ئەویش گەورە و مەزنە، لە هەموو شتێك، بەرز و بڵندیشە بەسەر گشت شتێکدا.

## * ليس كمثله شيء وهو السميع البصير *

هیچ كەس و شتێك لە الله تعالی ناچێت، هەر الله تعالی بیسەرە بە وتەكانتان و بینەرە بە كردەوەكانتان.

بەڵێ عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە سیفاتەكانی الله تعالی پەك ناخەن و، نایچوێنن بە دروستكراوەكانی، بەڵكو باوەڕمان وایە كە ئەو سیفەتانەی باسكراوە سیفاتی الله تعالی ـن، بەڵام جیاواز لە دروستكراوەكانی و، باوەڕمان پێیەتی، بەڵام چۆنیەتییەكەی نازانین، هەروەكو لە قورئان و حەدیسە سەحیحەكان باسكراون.

**نموونە:** لە فەرموودەیەكی (قودسی) دا هاتووە: (( لا تزال جهنم يلقى فيها وتقول: هل من مزيد؟ حتى يضع رب العزة فيها قدمه فتقول: قط. قط، وعزتك وكرمك -أي كفى كفى -فينزوى بعضها إلى بعض ..)). [بخاری ومسلم ١٢٨٧/٤١]

بەڵێ بڕوامان بە سیفەتی (قەدەم) هەیە، وەك لە فەرموودەكاندا هاتووە و دەستكاریشی ناكەین، بەڵام شێوە و چۆنیەتییەكەی دەگێڕینەوە لای الله.

ئیمامی (ئیبن کەسیر) کە دەگاتە تەفسیری ئایەتی: (یوم نقول لجهنم هل أمتلأت ..) دەڵێ: لەبەر ئەوە کە الله بەڵێنی داوە دۆزەخ بە مرۆڤ و جنۆکە پڕ بکات ڕۆژی قیامەت، پێی دەڵێت: ئاخۆ پڕ بوویت ؟ پاشان ئەوی تێچوو و هەڵدرایە نێویەوە هێشتا هەر دەڵێ: ئاخۆ زیاتر هەیە ..؟ جا لەو کاتەدا هەر پڕ نابێ و داوای هیتری لێ دەکات، ئەوجا الله (پێی) پیرۆزی خۆی دەخاتە نێویەوە، ئەوسا لە هەیبەتی ئەوەدا دەچێتەوە یەك و دەڵێ: ( قط قط ). واتە: خوایە ! بەسمە، بەسمە، پڕ بووم و جێی کەسم نەماوە. زانایان دەڵێن: ئەو قسەی دۆزەخە ڕاستە و هەقیقەتی هەیە و، الله دەیهێنێتە گۆ و قسە، بۆیە الله پێی پیرۆزی خۆی تێدەخا، چونکە لەوپەڕی قوڵی و فراوانیدایە، ئیتر بەو شێوەیە لەملاو لەولاوە دێتەوەیەك و بچووك دەبێتەوە.

ئیمامی (بوخاری) و ئیمامی (مسلم) و ئیمامی (ئەحمەد)یش هەمان ڕاوبۆچوونیان هەیە و هەر یەکەشیان فەرموودەیەکی هێناوە و ئاشکراشە کە (قەدەم ، رجل) هەردووك یەك شتە.

جا کەوایە (قەدەم) سیفەتێکی الله یە، بەڵام دیارە ئەو قەدەمە وەك قەدەمی دروست کراوەکانی نییە.

(دارەمی) لە (ئیبن عەباس)ەوە دەڵێ: ((الكرسى موضع القدمين، والعرش لا يقدر قدره إلا الله)) حاکمیش لە (المستدرك)دا هێناویەتی و دەڵێ: (صحيح على شرط الشيخين و وافقه الذهبى وابن جرير).

**ئەو سیفەتانەی الله عز وجل کە بە عەقڵ و فیترەت جێگیر دەکرێن بۆی پێش قورئان و سوننەت :** ( السمع و البصر و الكلام و القدرة و العلو و الارادة و العلم ).

بە عەقڵ و فیترەت دەزانرێ الله عز وجل دەبیستێ و دەبینێ و قسە دەکات و توانای هەموو شتێکی هەیە و لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە هەم زاتی خۆی و هەم توانا و هەم هێزی و هەم پلە و پایەیی و بەبێ ویستی نابێ هیچ شتێك ڕوو بدات و زانستی هەموو شتێکی گرتۆتەوە و هیچ شتێك نییە لە ئاسمانەکان و زەویدا الله نەیزانێ بەڵکو پێش ڕووداوەکان شتەکان دەزانێ بەڵکو پێش ئەوەش بیاننووسێتەوە لە لوح المحفوظدا بەڵکو هەرشتێکیش کە نابێت ئەگەر ببێت دەزانێ چۆن دەبێت و بۆچی دەبێت.

* بیستن ( السمع ) پێچەوانەکەی کەڕییە.
* بینین ( البصر ) پێچەوانەکەی کوێرییە.
* قسەکردن - وتن ( الكلام ) پێچەوانەکەی لاڵییە.
* هێز و توانا ( القدرة ) پێچەوانەکەی لاوازی و پەککەوتەییە.
* بەرز و بڵندی ( العلو ) پێچەوانەکەی نزمیە و دەشێ ( بکەوێتە ژێر و خوار شتێ ترەوە).

* ویست ( المشیئة – الارادة ) پێچەوانەکەی لە ویست دەرچوون و بێ ویستییە ، نەبوونی ( نەبوونی توانای بەڕێوە بردن بە دوای خۆیدا دەهێنێت).

* زانست ( العلم ) پێچەوانەکەی جەهل و نەزانینە.

هەر یەکێك لەم سیفەتانە جێگیر بکرێ بۆ الله پێچەوانەکەی نەفی دەکرێ ، کە وترا الله دەبینێ ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە الله کوێر بێ پەنا بە الله ئەوانی تریش بە هەمان شێوە ، بە هەمان شێوە ئەگەر شتێك لەمانە نەفی بکرێ پێچەوانەکەی جێگیر دەبێ .

بۆیە نەفی کردنی هەر یەکێك لەمانە کوفرە بە الله سبحانە وتعالی پێش اقامة حجة و پێگەیشتنی قورئان و سوننەت چونکە هەر یەکێك لەمانە بۆ مخلوق کەم و کورتیە ئیدی چۆن بۆ الله کەم و کورتی نییە ؟؟.

ان شاء الله لە شوێنی خۆی بە بەڵگە ئەم سیفەتانە ڕوون دەکەینەوە کە مرۆڤ بە فیترەت دەیانزانێت ..

## چوار خاڵ کە پێویستە موسڵمانان خۆیانی لێ بپارێزن لەم بابەتەدا:

**یەکەم:** تعطیل (پەکخستن): واتە پەکخستن و ڕەتکردنەوی ناو و سیفەتەکانی اللە تعالی، (پەنا بە اللە). بۆ نموونە دەڵێین: اللە تعالی دەستی هەیە، کابرایەك دێت دەڵێت اللە تعالی دەستی نییە، ئەمە ئەم کابرایە هات تعطیلی سیفاتێکی اللە تعالی ی کرد کە "دەست"ە.
اللە تعالی لە قورئاندا و، رسول اللە (صل اللە علیە وسلم) لە سوننەدا باسی ناو و سیفەتەکانی اللە تعالی کراوە. بەڵگەش لەسەر سیفەتی دەستی اللە تعالی لە قورئاندا: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْۚ﴾ (الفتح: ١٠)

**دووەم:** التمثیل (لێکچواندن): واتە: نابێت ناو و سیفاتەکانی اللە تبارك وتعالی بچوێنی بە بەندە و دروست کراوەکانی. بۆ نموونە: ناتوانیت بڵێیت: اللە تعالی دەستی وەك دەستی مرۆڤەکانە (والعیاذ باللە).
بۆیە ئەهلی سوننە بەتوندی دژایەتی ئەو گروپانە دەکەن کە لێکچواندن دەکەن لە سیفەتەکانی اللە دا.

**سێیەم:** التکیف (چۆنایەتی): واتە: نابێت بڵێین دەستی اللە تعالی ئەوەندە و ئەوەندە درێژە و شێوەکەی وایە و وایە، والعیاذ باللە،

ئەمەش هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و کوفرە، چونکە الله تعالی باسی چۆنیەتی شێوازەکانی نەکردووە.

وەك ئیمامی مالیك دەربارەی سیفەتی "استواء" (بەرزبوونەوە) دەفەرموویت: استواء (بەرزبوونەوە) زانراوە چونکە لە قورئاندا باسکراوە، بەڵام چۆنیەتییەکەی نەزانراوە چونکە باس نەکراوە، ئیمان هێنان پێی واجبە، چونکە ئایەتی قورئانی پیرۆزە، پرسیار کردنیش لەسەر چۆنیەتی بەرزبوونەوەی الله تعالی بۆ سەر عەرشی پیرۆزی بیدعەیە، چونکە هاوەڵان ئەم پرسیارەیان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەکردووە، هەروەها چواندنی بە بەرزبوونەوەی دروستکراوەکان کوفرە. ئەم یاسایەش باقی سیفاتەکانی تر دەگرێتەوە.

## چوارەم: تحریف (شێواندن و گۆڕینی مانای سیفەت و ناوەکان):

بۆ نموونە: الله تعالی سیفەتی (استواء)ی هەیە، واتە: بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرش یان سیفەتی (علو) بەرزیەتی الله تعالی، کەچی ئەهلی بیدەع دێن تەحریفی ئەم سیفەتانە دەکەن و دەڵێن: نا ئەمە مانای ئەوە نادات بەڵکو مانای تری هەیە، بۆ نموونە دەڵێن (استواء) بە مانای (استولی) دێت پەنا بە الله لەم جۆرە کوفرە.

(ابن القیم) دەفەرموێت: ئەو لامەی کە زیادی دەکەن (استوی) دەکەن بە (استولی) چەند لەو نون (ن) ـە دەچێت کە بەنو ئیسرائیل

زیادیان کرد که الله تعالی فەرمووی: بڵێن: (حطة) ئەوان گوتیان: (حنطة) جا الله تعالی غەزەبی لێ گرتن. ئەو کەسانەش کە سیفاتی الله تعالی تەئویل دەکەن و ماناکانی دەگۆڕن با لە الله بترسن نەبادا وەکو بەنی ئیسرائیل الله تعالی غەزەبیان لێ بگرێت.

هەروەکو چۆن زانیمان الله تعالی لە هیچ کەسێك و شتێك ناچێت، گرنگە ئەوەش بزانین کە الله تعالی بە هەموو کارو کردەوەیەکمان ئاگادارە و هیچ شتێك شاراوە نییە لە لای الله تعالی.

الله تعالی دەفەرموویێت: (وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا) (النساء: ١٠٨)

واتە: جا هەر کارێك ئەوان بیکەن، بێگومان کە الله لێی بە ئاگایە و ناتوانن هیچ شتێکی لێ بشارنەوە و تۆڵە و پاداشتیشیان دەداتەوە.

هەروەها دەفەرموویێت: (وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطًا ) (النساء: ١٢٦)

واتە: هەر الله یە کە بە هەموو شتێك بە ئاگا و زانایە، هیچی لا ون نابێت.

## * وأنه تبارك وتعالى يرى في الآخرة، يراه أهل الجنة بأبصارهم ويسمعون كلامه كيف شاء وكما شاء *

الله تعالى له قیامەت دەبینرێت، وە ئەهلی بەهەشت دەیبینن بە چاوەکانیان، و گوێ بیستی وتەکانی الله دەبن چۆن بیەوێت و هەرچۆنێك بیەوێت.

الله تعالى دەفەرمووێت: (إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ) (القيامة: ٢٣)

واتە: بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن.

جەماوەری زانایان - وەك لە چەندین فەرموودەی ڕەوا و (صەحیح) وەرگیراوە دەڵێن: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بەندە ساڵحەکان تەماشای خوای خۆیان (الله) دەکەن و بە چاوی خۆیان دەیبینن، وەك چۆن بە ئارەزووی خۆیان تەماشای مانگە شەوی چواردە دەکەن و دەبینن.

(ئیبن کەسیر) دەڵێ: ڕای کۆی هاوەڵان و شوێنکەوتووان (الصحابة والتابعون)یش هەر ئەمەیە، وە هەموو پێشەوایانی ئیسلام پاش ئەوانیش یەك دەنگن تێیدا.

پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) بۆ پشتگیری لەو مەبەستە دەفەرمووێ:
(( إنكم ترون ربكم كما ترون هذا القمر ..)) [فتح البارى: ٤٢٩/١٣ و مسلم: ٤٣٩/١]

الله سبحانه وتعالى دەفەرمووێت: (لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ أُولَـٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (يونس: ٢٦)
واتە: (للذين أحسنوا الحسنى) بۆ ئەوانەش چاکە دەکەن، پاداشتی زۆر چاك و بەهەشت هەیە، (وزيادة) واتە: دیتنی ڕووی پیرۆزی الله تعالى و تەماشا کردنی! (ولا يرهق وجوههم قتر ولا ذلة) واتە: تۆزو غۆبارو سەرشۆڕی لە دەم و چاویان نانیشێ، وەك چۆن لە دەم و چاوی دۆزەخییەکان دەنیشێ (أولئك أصحاب الجنة) ئەوانە یارانی بەهەشتن، (هم فيها خالدون) بە هەتا هەتاییش تێیدا دەمێننەوە و لێی دەرناچن.

هەروەها الله تبارك وتعالى دەفەرمووێت: (كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ) (المطفيفين: ١٥)
واتە: ئاگاداربن ! بەڕاستی ئەوانە لەو ڕۆژەدا بەربەست لە دیتنی پەروەردگاریان هەیە و نایبینن.

پێشەوا (شافیعی) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دیتن و بینینی الله تعالی لە ڕۆژی دواییدا؛ پێشەوا (مالیك)یش دەڵێت: کاتێك کە دیتنی زاتی الله دوژمنانی لێ بێبەش بکرێت، ئەوا بێگومانە کە زاتی خۆی دەردەخات بۆ دۆستەکانی.

**بینینی الله لەلایەن بەهەشتیەکانەوە لە قیامەت:**

محمدی کوڕی حمیدی ئەندرابی دەڵێت : گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حنبل بوو دەیگوت : ئیمان بریتییە لەوەی پێت وابێ ئەهلی بەهەشت الله دەبینن.

طبقات (٢/٢٩٤).

لە مسددی کوڕی مسرهدەوە ، ئیمامی أحمد بۆی نووسی : ئەهلی بەهەشت الله دەبینن بەبێ هیچ دوودڵیەك.

طبقات (٢/٤٣٠).

محمدی کوڕی عەوفی طائی دەڵێت : ئەحمەدی کوڕی حنبل پێی گوتم : ئەهلی بەهەشت الله دەبینن بەچاوی خۆیان.

طبقات (٢/٣٤١).

## حوکمی ئەو کەسەی نکۆڵی بینینی الله دەکات لە ڕۆژی دواییدا لەلای سەلەف:

الآجری دەڵێ : ئەگەر نەزانێك نارەزایی دەربڕی لەوانەی کە هیچ زانستێکیان لەلا نییە ، یان هەندێ لەو جەهمییانەی کە ڕێی ڕاستیان پێ پیشان نەدراوە (بەرچاو ڕوون نەکراونەتەوە) شەیتان یاری پێ کردوون و بێبەش بوون لە هیدایەت و ڕێی ڕاست گوتی : ئیمانداران الله دەبینن لە ڕۆژی دواییدا ؟

بگوترێ : بەڵێ سوپاسێکی بێ کۆتا بۆ الله تعالی لەسەر ئەوە ، ئەگەر جەهمییەکە گوتی : من باوەڕم بەوە نییە ، پێی بگوترێ : کافر بووی بە الله ی مەزن، ئەگەر گوتی : بەڵگە چییە ؟ (واتە بەڵگە چییە بۆ کافر بوونەوەی)

پێی بگوترێ : چونکە تۆ بەرهەڵستی قورئان و سوننەت و وتەی هاوەڵان و وتەی زانایانی موسڵمانان دەکەیت ، وە شوێن ڕێگەی غەیری ئیمانداران کەوتوویت ، وە تۆ لەوانەی الله پێیان دەفەرمێ :

(ومن يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى و يتبع غير سبيل المؤمنين نوله ما تولى و نصله جهنم وسآءت مصيرا) (النساء: ١١٥).

واتە: هەرکەسێك پاش ئەوەی ڕێگەی هەق و ڕاستی بۆ دەرکەوت و شارەزای دینی الله بوو ، دژایەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکا و ڕێگا و ڕێبازێك بگرێتە بەر، کە ڕێگای ڕاستی باوەڕداران نەبێت ئێمەیش ڕووی دەکەینە ئەو بەرنامە و ڕێگایە بە ئارەزووی خۆی لە

دنیادا هەڵیبژاردووە، ئیتر ئێمە وازی لێدێنین و، هەقمان نییە بەسەریەوە و، لە قیامەتیشدا دەیخەینە ناو ئاگری تاودراوی دۆزەخەوە ، ئای کە دۆزەخ جێ و ڕێیەکی زۆر سامناك و خراپە و، بۆیان ئامادەکراوە.

الشريعة للآجري (ب ٢ - ل ٩٧٦).

يحيى بن أيوب دەڵێ : ئێمە ڕۆژێك لەلای مروان بن معاوية الفزاري بووین ، پیاوێك پرسیاری لێکرد سەبارەت بە فەرموودەی (بینینی الله) ئەویش هیچ قسەی لەسەر نەکرد ، پێی گوت (واتە پیاوەکە) ئەگەر قسەم بۆ نەکەیت لەسەری ئەوە تۆ جەهمیت ، مروان گوتی : بە من دەڵێی جەهمی لە کاتێکدا جەهم چل ڕۆژی لێ ڕۆیی پەروەردگاری نە دەناسی (نوێژی نەکرد).

خلق أفعال العباد للبخاري ل (١٦).

أبو عبدالله أحمد بن حنبل دەڵێ : جەهمییەکان وتیان الله لە ڕۆژی دواییدا نابینرێ ، ئێمەش دەڵێین ، بە دڵنیایی الله دەبینرێ ، لەبەر وتەی الله عز وجل (وجوه يومئذ ناضرة * الى ربها ناظرة).

وە دەڵێ : هەرکەس بڵێ : الله لە ڕۆژی دواییدا نابینرێ ئەوە کافرە وە قورئانی بە درۆ زانیوە وە بەرهەڵستی الله ی کردووە لە کارو فەرمانێکیدا ، داوای تەوبەی لێ دەکرێت ئەگەر تەوبەی کرد وە ئەگەر نا دەکوژرێ.

السنة للخلال (٢٢٨٣ / ١٣٢).

وه ده‌یگوت : كاره‌ساته‌كه‌یان بووه‌ته‌ كوفرێكی ئاشكرا ، ده‌ڵێن : الله تبارك وتعالى له‌ ڕۆژی دواییدا نابینرێ.
السنة للخلال (٢٢٨٤ / ١٣٣).

وه‌ هه‌روه‌ها ده‌ڵێ : وته‌ی الله جل جلاله (هل ينظرون الا أن يأتيهم الله في ظلل من الغمام و الملائكة) – (وجاء ربک والملک صفا صفا) .
هه‌ركه‌س بڵێ : الله نابینرێ (واته‌ له‌ ڕۆژی دواییدا) ئه‌وه‌ كافره‌.
السنة للخلال (٢٢٨٧ / ١٣٦).

أبو صفوان ده‌ڵێ: (المتوكل م) بینی له‌ خه‌ودا ئاگرێكی گه‌وره‌ی بڵێسه‌داری له‌به‌ر ده‌ست بوو ، گوتم : ئه‌ی ئه‌میری باوه‌ڕداران ئه‌مه‌ بۆ كێیه‌ ؟ گوتی : بۆ ابن المنتصر ه‌ ، چونكه‌ ئه‌و كوشتمی ، وه‌ ده‌زانی بۆ كوشتمی ؟ چونكه‌ من بۆم گێڕایه‌وه‌ كه‌ الله ده‌بینرێ له‌ ڕۆژی دواییدا.
السنة للخلال (٢٢٨٨ / ١٣٧).

(المتوكل) یه‌كێكه‌ له‌ ئه‌میری باوه‌ڕداران كه‌ له‌ دوای مأمون و معتصم و واثق ـه‌وه‌ ده‌سه‌ڵات ده‌گرێته‌ ده‌ست كه‌ ئه‌و سیانه‌ پشتگیری جه‌همیه‌كانیان كرد و له‌ فیتنه‌ی خه‌لقی قورئان كه‌وتن ، به‌ڵكو زانایانی ئه‌و كاته‌یان خسته‌ ژێر ئازار و زیندان ... هتد، له‌وانه‌ محمد بن نوح و الخزاعي و أحمد بن حنبل و يحيى بن معين هتد ....كه‌ هه‌موویان له‌

فیتنەكە كەوتن تەنها ئەو سیانەی سەرەتا نەبێت بەڵام متوكل بە سەرخەری سوننە ناسراوە لەوان نەبوو شكۆ و گەورەیی گێڕایەوە بۆ موسڵمانان و جەهمیەكانی خست ... بە كورتی.
جا بۆیە ابراهیم الحربي ووتی : ئەم خەو بینینە (خەوەكەی أبو صفوان كە بە متوكل) ی بینی ڕاستە ، وە بەو شێوەیە متوكل فەرموودەی حماد بن سلمة لە یعلى بن عطا لە وكیع بن حدس ەوە دەربارەی بینی الله بە دەستی خۆی نووسیەوە ، لە عبد الأعلى وە گوتی : بە دەستی خۆم نەبێت نایننووسمەوە.
السنة للخلال (٢٢٨٨ / ١٣٧).

أحمد بن غسان گوتی : پرسیم لە حمدویە : بە چ شتێك زەندیقەكان دەناسرێنەوە ؟
گوتی : زەندیقەكان چەند بەشێكن ، بەڵام من بینیم دەیگوت : الله لە ڕۆژی دواییدا نابینرێ ، وە قورئان مەخلوقە ، ئەوە زەندیقە.
السنة للخلال (٢٢٩٠ / ١٣٩).

پیاوێك گوتی بە مالك بن أنس (امام مالك) ئەی أبو عبدالله ، كۆمەڵێك لە خەڵكی وا دەزانن الله لە ڕۆژی دواییدا نابینرێ ، مالك گوتی : شمشێر شمشێر (واتە بدرێ لە گەردنیان).
شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة للالكائي (٨٠٨ ).

ابن بطة العكبري دەڵێ : جەهم بن صفوان لە مناظرەکەی لەگەڵ مولحیدەکاندا گوتی پێیان : بەهەمان شێوە الله عز وجل نابینرێ نە لە دونیا نە لە ڕۆژی دواییدا ، وە لە هەموو شوێنێکە لە شوێنێك نییە لە شوێنێکی دیکە نەبێ ، وە سێ ئایەتمان دۆزیەوە لە کتابەکەی الله عز وجل ، وتەی کە دەفەرمێ (ليس كمثله شيء) ، وە (وهو الله في السماوات و في الأرض) ، وە

(لا تدركه الأبصار).

بنەمای قسەکانی لەسەر ئەم سێ ئایەتە دامەزراند ، دینی جەهمییەکانی دانا وە فەرموودەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بە درۆ دانا (بێ باوەڕی خۆی دەربڕی پێیان) وە تەئویلی کتێبەکەی الله ی کرد بە تەئویلی خۆی ، لە خەڵکی بەسرە هاوەڵانی عمرو بن عبيد وە خەڵکانێك لە هاوەڵانی أبو حنيفة شوێنی کەوتن ، وە خەڵکێکی زۆر بە قسەکانی گومڕا بوون. الابانة الكبرى (٣١٧ / ٣١٤).

گوتم بڕوانە دەڵێ : دینێکی داهێناوە ، ئەمە تەکفیرێکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ جەهمییەکان و ناوبردنی نەبینینی الله عز وجل و جێگیر نەکردنی بینینی الله لە ڕۆژی دوایی بە کوفر و دینێك لە غەیری دینی ئیسلام.

وە بە درۆ ناوبردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) ، بەڵکو باوەڕ نەبوونە بە قورئان و کۆدەنگی زانایانیش نەك تەنها چەندین فەرموودە ئەوەش بۆ خۆی کوفرێکی زۆر گەورە و زۆر ئاشکرایە ، بەڵکو باوەڕ نەبوون بە یەك فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

کوفری گەورەیە و خاوەنی لە دینی موسڵمانان پێی دەردەچێ چ جای باوەڕ نەبوون بەو هەموو ئایەت و فەرموودە و وتە و کۆدەنگی زانایانی سەلەف.

بە هەمان شێوە گوتی : تەئویلی ئایەتەکانی دەکرد ، ئێستاش زۆرێك بە ناوی تەئویلەوە بیانوو و پاساو دەهێننەوە بۆ ئەشعەری و ماتوریدی و موعتەزیلەکان و کوللابیەکان کە هەموویان هەر جەهمییەکانن بەڵام بە کەمێك گۆڕانکاریەوە ، جەهمییەکانیش تەئویلیان هەبوو هەروەك چۆن ئەمان هەیانە هەروەك هەموو گروپە کافر و گومڕاکانی تر هەر تەئویلیان هەبوو و بەڵگەیان یان بە قورئان یان بە فەرموودە دەهێنایەوە بەڵام ئەوە نابێتە عذر و بیانوو بۆیان.

تەئویل واتە تەفسیر و مانا کردن و لادانی هەندێ دەقە لە مانا ئاشکراکە، وە دوو جۆرە هەندێکی تەئویلی حەققە کە ئەمە کێشە نییە و واجبە کردنی بەڵام هەوا و ئارەزووی تیا نییە بەڵکو بە پێی دەقە تەفسیرەکە ، وە هەندێکی پوچ و درۆیە کە ئەمە گومڕاییە لە کەمترین حاڵدا وە شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووە کە ئەمە تەئویلی هەر حەفتاو دوو گروپە گومڕاکانە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسی کردوون و ئەوە کە تەئویل بە حەق دەکەن ئەوانەن شوێنی هاوەڵان دەکەون.

أحمد بن عمرو دەڵێ : هەندێ لە هاوەڵانمان لە خاوەن زانستەکان جەهمییەکان کافر بوونەوە .. چەندین جۆر کوفر و زەندەقەیان لە خۆیان کۆ کردەوە ، وە نکۆڵی ئەوەیان کرد (واتە جەهمییەکان) کە الله دەبینرێ لە ڕۆژی دواییدا.
الابانة الكبرى (٤١١).

عبدالرحمن بن عمرو الأوزاعي گوتی : ئومێد دەکەم الله جەهم و هاوەڵەکانی (شوێنکەوتووانی) بێبەش بکات لە گەورەترین و چاکترین پاداشتی خۆی ئەوەی کە بەڵێنی داوە بە دۆستانی (بۆیان بکات) کاتێك دەڵێ (وجوه يومئذ ناضرة * الى ربها ناضرة) جەهم و هاوەڵەکانی نکۆڵیان لە چاکترین پاداشتی الله کرد کە بەڵێنی بە دۆستانی داوە پێی.
شرح أصول اعتقاد للالكائي (٨٧٤).

سفيان بن عيينة دەڵێ : هەرکەس نەڵێ قورئان کەلامی الله یە وە الله لە بەهەشتدا دەبینرێ ئەوە جەهمییە.
شرح أصول اعتقاد للالكائي (٨٧٦).
وە أبو مروان الطبري لێی گێڕاوەتەوە (لە سفيان بن عيينة) : نوێژ لە پشت جەهمییەوە ناکەین ، وە جەهمیش ئەوەیە کە دەڵێ : پەروەردگارەکەی لە ڕۆژی دواییدا نابینرێ.
شرح أصول اعتقاد للالكائي (٨٧٨).

يحيى بن المغيرة دەڵێ : ئێمە لە لای جرير بن عبدالحميد بووين فەرموودەی ابن سابط ی بۆ باسکرا (للذين أحسنوا الحسنى و زيادة) گوتی : (الزيادة) واتە : ڕوانين بۆ ڕووی الله تبارك و تعالى ، گوتی : پياوێك ئامادەی بوو و نکۆڵی کرد ، ئەويش بانگی کرد و کرديە دەرەوە لە مەجليسەکەی.

شرح أصول اعتقاد للالكائي (٨٨٠).

عقبة بن قبيصة دەڵێ : أبو نعيم الفضل بن دكين دەرچوو بۆ لامان تورە کرابوو ، گوتی : سفيان بن سعيد بن المسروق الثوري باسی کردووە بۆمان وە الحسن بن صالح بن حي بۆی باسکردووين وە شريك بن عبدالله النخعي بۆمانی باس کردووە وە زهير بن معاوية باسی کردووە بۆمان : هەموويان لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە ئێمە پەروەردگارمان دەبينين ، کەچی ابن صباغ ـی (يەهودی) جولەکە هاتووە نکۆڵی بينينی دەکات.
مەبەستی (بشر بن غياث المريسي) ـە کە کافرە.

هەروەها گوێبيستی وتەکانی الله تعالى دەبين، هەرچۆنێك بيەوێت، هەروەکو الله سبحانه وتعالى دەفەرمووێت: (وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰ أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (الشعراء: ١٠)
واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەو کاتەيان بەبير بێنەوە کە پەروەردگارت لە لای کێوی طوردا موسای بانگکرد: کە وتی بچۆ بۆ

لای ئەو گەلە ستەمکارە، ئەوانەی ستەمیان هەم لە خۆیان و، هەم لە گەلی بەنی ئیسرائیل کردووە و، کردوویانن بە کۆیلە.

هەروەها الله عز وجل دەفەرموویت: (وَنَادَيْنَاهُ مِن جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيًّا) (مريم: ٥٢)
واتە: لەلای ڕاستی کێوی (طور)ـەوە بانگمان کرد و، بەبێ هۆو واسیتەش وتووێژمان لەگەڵ کرد، (وقربناه نجيا) وە لە خۆشمان نزیکمان کردەوە تا بە نهێنی قسە و گفتوگۆی لەگەڵ بکەین.

هەروەها لە حەدیسی سەحیح هاتووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: ((يقولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ القِيَامَةِ: يا آدَمُ، يَقولُ: لَبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ، فيُنادَى بصَوْتٍ: إنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أنْ تُخْرِجَ مِن ذُرِّيَّتِكَ بَعْثًا إلى النَّارِ)). أخرجه البخاري: كِتابُ تَفْسِيرِ القُرْآنِ, بابُ (وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ)(الحج: ٢), (٤٧٤١)، واللفظ له، ومسلم: كتاب الإيمان، رقم (٢٢٢). الله تعالى بە دەنگ بانگی ئادەم دەکات (عليه السلام).

* والجنة حق والنار حق وهما مخلوقتان لا يفنيان أبدا، والجنة ثواب لأوليائه، والنار عقاب لأهل معصيته إلا من رحم *

بەهەشت و دۆزەخ ڕاست و حەقن، دوو دروستکراون هەرگیز کۆتاییان نایەت و لەناوناچن، بەهەشت پاداشتە بۆ ئەولیاکانی، و ئاگریش جێگای ئەهلی سەرپێچی کارانە، تەنها ئەوە نەبێ کە ڕەحمی پێکراوە.

بەڵگەکانی قورئان لە باسی بەهەشت و دۆزەخ زۆرن، بەڵام چەند دانەیەك دەخەیەنە ڕوو ...

الله تعالى لە باسی بەهەشتدا دەفەرمووێت: (وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ) (ال عمران: ١٣٣)

واتە: پەلە و چەسپانی بکەن بۆ کردنی ئەو شتانەی دەبنە هۆی لێبووردنی پەروەردگارتان و چوونە بەهەشتێکی فراوانی وا کە: هەر پانتاییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە. پێشەوا ئەحمەد دەڵێت: (أعدت للمتقين) ئامادە کراوە (ئەو بەهەشتە) بۆ پارێزکاران. زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ ئەوە کە ئێستا بەهەشت ئامادە کراوە و هەیە.

جا الله تعالى دەفەرموویت: (وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُوا هَـٰذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)(البقرة: ٢٥)

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ! مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان بە خواو بە پەیامبەرو بە ڕۆژی دوایی هەیە و، ئاکارە چاك و پەسەندەکان ئەنجام دەدەن کە بێگومان بەهەشت گەلێکیان بۆ هەیە، کە چەندین کانیاو و ڕووبار لەژێر درەختەکانییدا دێن و دەچن، هەر کە لەو بەرهەم و میوەی بەهەشتانەیان بۆ دێنن و دەیچێژن دەڵێن: خۆ هەر ئێستا لەمەتان بۆ هێناین، ئەمە هەر ئەو ڕۆزییە بوو کە پێشتر پێماندرا، دیارە ئەو میوەجاتەی لە بەهەشتا بۆیان دەهێنرێ، هەموو - لە چاکی و باشیدا بە ڕەنگ - لەیەك دەچن، بەڵام بە تام و لەزەت لێك جیاوازن.

(ئیبن ئەبی حاتەم) ئەم فەرموودەیە دێنێ: (( أنهارُ الجنةِ تَفَجَّرُ تحت تِلالٍ، أو من تحت جبال المِسْكِ )) واتە: ڕووبارەکانی بەهەشت لەبن چەند گرد و تەپۆڵکەیەك، یان لە ژێر چیای ( میسك )ـەوە هەڵدەقوڵێن.

جا لەو بەهەشتەدا چەندین ئافرەت و هاوسەری پاك و خاوێنیان بۆ ئامادە کراوە، و بە هەتا هەتاییش لەوێ دەمێننەوە و ژیانێکی خۆش دەبەنەسەر.

الله تعالى لە باسی دۆزەخدا لە قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت: (وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ)(ال عمران: ١٣١)
واتە: لەو ئاگرەی بۆ بێباوەڕان ئامادە کراوە خۆتان بپارێزن.

هەروەها الله سبحانە وتعالى دەفەرموویێت: (فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (البقرة: ٢٤)
واتە: دەسا وەرن باوەڕ بێنن و خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە دەستەچیلەو هەڵگیرسێنەرەکەی جەستەی ئادەمی و بەردە، دان بەوەیشدا بنێن کە ئەم قورئانە لەلایەن خواوەیە، ئەگینا دەبنە سووتەمەنی ئەو ئاگرەی (أعدت للكافرين) کە ئێستا بۆکافران و بێ باوەران ئامادە کراوە.

ئەوەش بزانە بەهەشت و دۆزەخ هەرگیز كۆتاییان نایەت.

هەروەك الله تعالى لە باسی ئەهلی بەهەشت دەفەرموویت: (جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا) (البينة: ٨)

واتە: پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان چەند باخاتێكی هەمیشەیی بەهەشتە كە لەبن درەختەكانیەوە چەندین جۆگە ئاو و ڕووبار دەڕوات، وە بە ئێجگاری و هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە و ژیان دەبەنە سەر.

هەروەها الله تبارك وتعالى لە باسی دۆزەخدا دەفەرموویت: (وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ)(فاطر: ٣٦)

واتە: بۆ ئەو كەسانە كە كافر و بێ باوەڕن، ئاگری دۆزەخ هەیە، بڕیاری مردنیان بۆ نادرێ تا بمرن و لەو سزایە ڕزگار ببن، شتێكیش لە سزای دۆزەخیان لێ سووك ناكرێ، هەر ئا بەو جۆرەیە - وەك ئەوانە - هەموو بێبڕوایەك سزا دەدەین.

هەروەها دەفەرموویت: (فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا) (البينة: ٦)

واتە: دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە هەتا هەتایی تێیدا قەتیس دەبن.

هەروەها بەهەشت تەنیا بۆ ئیماندارانە و دۆزەخیش بۆ سەرپێچیکاران و کافرانە.

تەنیا بڕواداران دەچنە بەهەشتەوە، هەروەکو الله عزوجل دەفەرمووێت:
(إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ) (المائدة: ٧٢)

واتە: چاك بزانن كە هەركەسێك شەريك و هاوبەش بۆ الله دابنێ، بێ شك الله بەهەشتی لەسەر یاساغ و قەدەغە دەكات و جێ و شوێنی ئاگرە.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (( إن الجَنَّةَ لا يَدْخُلُهَا إلا نَفْسٌ مسلمةٌ - وفى لفظ - مؤمنةٌ )) . واتە: بەدەر لە موسڵمان یان ئیماندار كەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە.

# * والصراط حق *

وه پردی صرات ڕاست و حەقە.

هەروەکو الله تبارك وتعالى دەفەرموویێت: (وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا) (مريم: ٧١)

واتە: ئەی خەڵکینە ! ئیللا دەبێ هەموو نزیکی ئاگری دۆزەخ ببنەوە و بەسەر پردەکەی (صیراط) دا تێپەڕن، وە بە تەفسیرێکی تر: دەبێ هەموو بەسەر دۆزەخدا تێپەڕن. (كان على ربك حتما مقضيا) ئەمەش بڕیارێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئەوە دراوە و بڕاوەتەوە و شتێکی حەتمییە.

هەروەها الله تعالى دەفەرموویێت: (يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (التحريم: ٨)

واتە: لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) الله پەیامبەرو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ڕیسواو سەرشۆڕ ناکات بەڵکو سەربەرزیان دەکات (نورهم يسعى بين أيديهم وبأيمانهم) وە ئەم باوەڕدارانە نور و ڕووناکیان لەبەردەمیانەوە و لەلای ڕاستیانەوە دەڕوات و ڕێگای سەر پردی (صراط) یان بۆ ڕووناك دەکاتەوە و بەسەریدا دەڕۆن (يقولون ربنا

أتمم لنا نورنا) و دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە ! نوور و ڕووناکییەکەمان بۆ تەواو بکە و بەردەوام بێت (واغفر لنا) و لێمان خۆش ببە (إنك على كل شئ قدير) بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایت.

## * والميزان الذي له كفتان يوزن فيه أعمال العباد حسنها وسيئها حق *

وە ئەو تەرازووەی کە دوو لای هەیە، چاکە و خراپەی بەندەکانی پێ دەکێشرێت، ڕاست و حەقە.

هەروەکو الله تعالى دەفەرموویت: (وَالْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (الاعراف: ٨)

واتە: جا کێشانە و لێکدانەوەی کارو کردەوەی گشت ئەو خەڵکانە، لەو ڕۆژی قیامەتەدا بەڕاستی و دادگەرانە دێتە پێش و، ستەم لە هیچ کەسیش ناکرێت (فمن ثقلت موازينه) ئینجا هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوەکانی گران و قورس بێت لای الله، واتە: کارو کردەوەی دنیای چاك بێت (فأولئك هم المفلحون) دیارە هەر ئەوانە بەختیار و سەرکەوتوو و سەرفرازن.

هەروەها الله تبارك وتعالى دەفەرموویت: (وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ) (الأنبياء: ٤٧)

واتە: بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا ئێمە تەرازووی بەرامبەر دادپەروەری دادەنێین بۆ کێشانی خۆتان و کارو کردەوەکانتان، ئەوسا هیچ

کەسێك کەمترین ستەمی لێناکرێ چ لە چاکەکاران و، چ لە خراپەکاران، تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیان بە ئەندازەی سەنگی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت کە لە بچووکیدا کراوە بە نموونە، ئێمە دەیهێنین و ئامادەی دەکەین، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە وردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین.

لەدوای بڵاوبوونەوەی نامەی کردەوەکان و لێپرسینەوە ئینجا تەرازووی عەدل دادەنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا. تەرازوویەکی حەقیقی، لە لسان وکفتان، زمانێکی هەیە و دوو تاشی هەیە بۆ کێشانی کردەوەکانمان و نامەی کردەوەکانمان و خۆشمان.

الله تعالى دەفەرموویت: (فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا) (الكهف: ١٠٥).

واتە: مرۆڤی وا هەیە کە دێت لە ڕۆژی قیامەت هیچ وەزنێکی نییە.

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): إنه ليأتي الرجل العظيم السمين يوم القيامة، لا يزن عند الله جناح بعوضة، وقال: اقرؤا إن شئتم: ((فلا نقيم لهم يوم القيامة وزنا)). متفق عليه.

واته: له ڕۆژی قیامەت پیاوێکی گەورە و قەڵەو دەهێنرێ ، کە لای الله وەزنی باڵە مێشولەیەکی نییە. پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئایەتی: (فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا) بخوێننەوە.

عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) أنه كان يجتني سواكاً من الأراك، وكان دقيق الساقين، فجعلت الريح تكفؤه، فضحك القوم منه، فقال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): مم تضحكون؟ قالوا: يا نبي الله من دقة ساقيه، فقال: والذي نفسي بيده لهما أثقل في الميزان من أُحُد. رواه أحمد والحاكم.

جارێکیان عبدالله ی کوڕی مسعود (رضي الله عنه) لەناو هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو، بە دارێکدا سەرکەوت بایەك هات پۆشاکەکەی هەڵدایەوە و قاچی دەرکەوت، هەندێك لەوانەی کە لەوێ بوون پێکەنین، چونکە عبدالله ی کوڕی مسعود قاچێکی باریکی هەبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بە چی پێدەکەنن ؟ گوتیان ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) بە باریکی قاچی پێکەنین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی سوێند بەو کەسەی کە نەفسی منی بەدەستە ئەم دوو قاچە باریکەی لە میزانی الله دا لە شاخی ئوحود قورسترە.

هەروەها پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - دەفەرموویێت: ((كلمتان خفيفتان على اللسان، ثقيلتان في الميزان، حبيبتان إلى الرحمن: سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم)) [متفق عليه].

واتە: دوو وشە هەن سووكن لەسەر زمان، قورسن لەسەر تەرازووی كێشان (ميزان)، خۆشەویستن لە لای الله تعالی ی میهرەبان: پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ الله، پاك و بێگەردی بۆ الله ی مەزن.

زانایان فەرموویانە كاتێك لێپرسینەوە كۆتایی پیێ هات ئینجا تەرازوو كردنی كردەوەكان بەدوایدا دێت، چونكە لێپرسینەوە بۆ جێگیر كردنی كردەوەكانە، تەرازوو كردنیش بۆ پاداشت وەرگرتنەوەیە بۆ ئاشكرا كردنی ئەندازەكەیەتی، بۆ ئەوەی بەگوێرەی ئەندازەی كردەوەكان پاداشت بدرێینەوە.

## * والحوض المكرم به نبينا حق *

هەروەها حەوزی کەوسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ـی پێ ڕێزدار کراوە ڕاست و حەقە.

ئەنەسی کوڕی مالیك (الله لێی ڕازی بێ) دەفەرمووێت: پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم - لە مزگەوتدا لە نێوانماندا بوو، کتوپڕ کەمێ خەوی لێکەوت، پاشان بە ڕوویەکی خۆش و گەش و لێو بە زەردەخەنەوە سەری بەرزەوە کرد، جا ئێمەش وتمان: هۆی ئەو زەردەخەنەیەت چی بوو ئەی پێغەمبەر ؟ !فەرمووی: هەر ئێستا ئەم سورەتەم بۆ هات و خوێندیەوە و فەرمووی: (بسم الله الرحمن الرحيم. إنا أعطيناك الكوثر. فصل لربك وانحر. إن شانئك هو الأبتر) پاشان فەرمووی: دەزانن (کەوسەر) چییە ؟ کەوسەر: چۆم و تاڤگە و ڕووبارێکە لە بەهەشتدا، بەرەکەتێکی ئێجگار زۆری هەیە، حەوز و گۆلاوێکە پەروەردگارم (الله) بەڵێنی پێداوم، کە لە قیامەتدا ئوممەتەکەم بێنە سەری، وە بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان لێوان و پەرداخ و سوراحی تێدایە، هەندێ کەس لێی بێبەش دەبێ، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگاری من ! خۆ ئەوانە لە ئوممەتی منن، الله دەفەرمووێت: تۆ نازانی پاش تۆ ئەوانە چییان کرد ؟ ![صحيح مسلم].

## * والشفاعة حق، وأن ناسا من أهل التوحيد يخرجون من النار بالشفاعة حق *

وه شەفاعەت ڕاست و حەقە، وە بەڕاستی کۆمەڵە کەسێك لە ئەهلی تەوحید دەردەچن لە ئاگر بەرەو بەهەشت بە شەفاعەتی حەق.

بەڵێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەفاعەت دەکات، وە هەروەها پیاوچاکانیش و، فریشتەکانیش و، شەهیدانیش شەفاعەت دەکەن، دوای ئەوەی الله ڕێگایان پێ دەدات، لەو سنورەدا کە بۆیان دادەنێت، بۆ ئەو کەسە شەفاعەت بکەن کە تەنها الله پەرست (مُوحِّد) بووە و، هاوبەشی بۆ الله پەیدا نەکردووە و، هاواری نەکردۆتە غەیری الله.

جا بێ ئەوەی ئێمەش داوایان لێ بکەین شەفاعەتمان بۆ بکەن، الله ڕێگای شەفاعەت کردنی پێ داون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەرامیشی کردووە کە ئێمە لە دونیا داوای شەفاعەت کردنیان لێ بکەین و هاواریان بکەینێ دوای مردنیان. چونکە هاوارکردنە غەیری الله شیرکە، وە داوای شەفاعەت لە مردوو ناکرێت، وە شەفاعەت هەمووی موڵکی الله یەو، داوا لە خاوەن موڵك دەکرێت کە (الله) یە، وە تاوەکو خۆی ڕێگا نەدات، کەس ناتوانێت شەفاعەت بکات و، بۆ کەسیش ناکرێت.

وە داواكردنی ئێمە لە شەفاعەتكاران هیچ سوودێكی نییە، بەڵكو زیانیشی هەیە، چونكە بە فەرمانی الله و ویست و ئیرادەی الله شەفاعەتكاران شەفاعەت دەكەن، نەك بە داواو هاواری ئێمە، وە لە خۆمانەوە بۆمان نییە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و چەند پیاو چاكێك دابنێین بە شەفاعەت كاری خۆمان و لەگەڵ الله هاواریان بكەینێ و داوای شەفاعەتیان لێ بكەین، چونكە ئەوان خاوەنی شەفاعەت نین و، ئێمەش لە خۆمانەوە نازانین ئایا ڕێگایان پێ دەدرێت شەفاعەت بۆ ئێمە بكەن یان نا، وە هەر كەسێك لەخۆیەوە شەفاعەتكار دابنێت بۆ خۆی و داوای شەفاعەتیان لێ بكات، ئەوە وەك موشریكەكانی كردووە و شەریكی بۆ الله داناوە و كافر بووە، سزاكەیشی ئەوەیە بێ بەش دەكرێت لە شەفاعەتی شەفاعەتكاران و كەس نابێت شەفاعەتی بۆ بكات.

وە ڕاستە لە ڕۆژی كۆبوونەوەی خەڵك لە مەحشەر، خەڵكی دەچن بۆ لای پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ بەگشتی پێغەمبەری خۆشمان صلی الله علیه وسلم بە تایبەتی، وە داوایان لێ دەكەن شەفاعەت بكەن لای الله بۆ ئەهلی مەحشەر، بەڵام ئەوە تایبەتە بە ڕۆژی قیامەت كاتێك كە پێغەمبەران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ زیندوو و حازر و ئامادەن لای خۆیان، وە گشت ئەو حەدیسانەی كە باسی ئەو شەفاعەتەمان بۆ دەكەن، هەموویان تایبەتیان كردووە بە ڕۆژی

دواییەوە، وە لە هیچ حەدیسێکی زەعیفیشدا نەهاتووە کە بڵێت ئەوە لە دوای مردنی دەبێت کاتێك کە لەناو گۆڕە !

هەروەها لە کتێبەکانی عەقیدەی ئیسلامی بە درێژی باس لە هەموو جۆرەکانی شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کراوە، وە لە هیچ کامێکیاندا باسی ئەوە نەکراوە کە جۆرێك لە شەفاعەتەکانی صلی الله علیه وسلم دوای مردنی بێت لە ناو گۆڕدا !

کەواتە داوای شەفاعەت کردن لە مردووانی ناو گۆڕ ـ جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بێت، یان پیاوچاکان ـ ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە و داهێنراو و بیدعەیەکی شیرکییە مرۆڤ پێی کافر دەبێت.

وە لەبەر ئەوە نابینین هیچ کام لە هاوەڵانی رضي الله عنهم دوای مردنی ڕۆیشتبنە سەر گۆڕەکەی و داوای شەفاعەت کردنیان لێکردبێت. بە ڵکو دەچوون داوایان لە زیندووەکانیان دەکرد، وەك لەساڵی وشکانی و بێ ئاویەکە داوایان لە عباس رضي الله عنه کرد دوعایان بۆ بکات.

جا بۆ زیاتر تێگەیشتن لە شەفاعەت، ئەوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت باسی لێوە دەکەین بۆ ئەوەی نەفام و تێنەگەیشتووان گومانی خراپ بە ئەهلی سوننەت نەبەن و، پڕوپاگەندە نەکەن کە گوایە باوەڕیان بە شەفاعەت نییە !! چونکە لە هەموو کەس زیاتر باوەڕمان بە

شەفاعەت هەیە و دڵیشمان خۆشە کە بەر شەفاعەت دەکەوین إن شاء الله؛ چونکە تەنها داوا لە الله دەکەین کە هەر ئەو خاوەنی شەفاعەتە و، هەمووی موڵکی خۆیەتی: (قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًاۖ لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) (الزمر: ٤٤)

واتە بڵێ: لێبوردن و بەخشین و تکاو شەفاعەت سەرلەبەر تەنها بۆ الله یە، هیچ کەسێکی دیکە شتێکی بە دەست نییە، خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ ئەوە و پاشانیش هەموو هەر بۆ لای ئەو دەگێڕدرێنەوە و دادگایی دەکرێن.

## جۆری یەکەم: شەفاعەتی شیرکی (الشفاعة الشركية)

ئەو شەفاعەتەی کە داواکردنی شیرکە: ئەم جۆرەیان ئەوەیە کە داوا بکرێت لە غەیری الله و هاوار بکرێتە پیاوچاکان و فریشتە و جنۆکە و قەبر، بۆ ئەوەی شەفاعەت بکەن لای الله بۆ هاوارکەر واتە: بەبێ ئیزن و فەرمانی الله، واسیتە و شەفاعەتکار دابنرێت بۆ ئەوەی شەفاعەت بکەن لای الله و شەفاعەت دانەریش سەربڕین و ماڵ بەخشین و هاوارکردن و بەگەورەدانان بکات بۆ ئەم واسیتە و شەفاعەتکارانە، وە دڵی ببەستێتەوە بە ئەوان و ئیعتیقادی پێیان بێت کە سوودی بۆ دابین بکەن و زەرەری لەسەر لابدەن بەهۆی شەفاعەت کردنیانەوە لای الله،

وە شەفیعەکانی خۆش بوێت لەگەڵ لێ ترسان و بەگەورە دانانیان و پشت پێ بەستنیان. !!

ئەم جۆرەش الله تعالی بە شیرکی داناوە و کوفرە و دینی موشریکەکانی کۆنە و لە جیاتی سوود گەیاندن زەرەر دەگەیەنێت و، لە جیاتی نزیك کردنەوە لە الله، دوورت دەخاتەوە لێی و کەسی ئەنجامدەر پێی کافر دەبێت.

جا الله سبحانە وتعالی لە چەندان ئایەتدا ئەم شەفاعەتە شیرکییەی باس کردووە بۆ نموونە:

**بەڵگەی یەکەم:** (وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ) (یونس: ١٨)

واتە: هاوبەشی پەیداکەران جگە لە الله شتی تر دەپەرستن و لێی دەترسن و دڵیان پێیان خۆشە و ئەمەلی خێریان پێیەتی و داوای سوود و قازانجی لێ دەکەن کە لەڕاستیدا هەر شتێك دەپەرستن جگە لە الله نە دەتوانێت زەرەریان لێ بدات ـ تاوەکو لێی بترسن ـ وە نە سوودیان پێ دەگەیەنێت ـ تاوەکو ئیعتیقادیان پێ بێت و ڕەجاو داوای لێ بکەن ـ هەروەها هاوبەشی پەیداکەران دەڵێن: ئێمە ئەم هاوار بۆ کراوانە

ناپەرستین سەربەخۆ واتە باوەڕمان نییە کە دروستکەرو ڕزق دەری ئێمە بن یان بتوانن خۆیان سوودمان بۆ بهێنن و زیانمان لەسەر لابدەن؛ بەڵام ئێمە لەبەر ئەوە ئیعتیقادمان پێیانە و هاواریان دەکەینێ بۆ ئەوەی شەفاعەتمان بۆ بکەن لای الله، چونکە ئەمانە شەفاعەتکارمانن لای پەروەردگاری تاك و تەنها !!

پەروەردگاریش قەبوڵی نییە بەو شێوەیە و لەم ڕێگایەوە خەڵکی داوای شەفاعەت لە الله بکەن و ڕێی ئەمەی پێ نەداون، بۆیە ئینکاری کرد لەو کارەیان و بە شیرکی دانا و بە پێغەمبەری فەرموو: پێیان بڵێ: ئەوە ڕێگایەکیان داناوە بۆ لە الله نزیك بوونەوە کە الله ئاگای لێ نییە ؟!

واتە ئێوە ڕێگا بۆ الله دادەنێن و شتێکی فێر دەکەن کە خۆی نەیزانێت ؟!. چۆن دەبێت ئەو ڕێگایەی ئێوە ڕاست بێت و الله ش پێی نەوتوون ؟! نەخێر ئەم کارەیان کە شەفاعەتکار دانانە لای الله شیرکە و پەروەردگاریش پاك و بەرزە لەم شیرکە.

**بەڵگەی دووەم:** (أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ شُفَعَاءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ (٤٣) قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٤٤) ) (الزمر)

واتە: ئایا ئەو موشریکانە، پەرستراوەکانی خۆیان داناوە بە شەفاعەتکاریان و، وا دەزانن کە هاواریان کردنێ و پشتیان پێ بەستن

و ئیعتیقادیان پێیان بوو و داوایان لیٚ کردن، وا دەزانن بەوە شەفاعەتیان بۆ دەکەن، وە ئایا وا گومان دەبەن کە شەفاعەت موڵکی مەعبودەکانیانە ؟ وە ئەگەر داوایان لیٚ کردن ئەوانیش شەفاعەتیان بۆ دەکەن ؟!

ئەی محمد صلی الله علیه وسلم بەو موشریکانە ـ بفەرموو: ئایا ئێوە هەر بە شەفاعەتکاری خۆتانیان دادەنێن، هەرچەندە هیچیشیان بەدەست نەبێت و، خاوەنی شەفاعەتیش نەبن و ئاگاشیان لە هاوار و داواکاری ئێوەش نەبێت ؟!

ئەی محمد صلی الله علیه وسلم بفەرموو: شەفاعەت هەمووی موڵکی الله یەو ئەوانەی ئێوە داوای شەفاعەتیان لیٚ دەکەن خاوەنی شەفاعەت نین، کەواتە دەبێت داوای شەفاعەت تەنها لە الله بکرێت کە خاوەنیەتی، نەك لەوانەی هیچیان بەدەست نیە و، خاوەنی هیچ سوود و زیان و موڵکێك نین، بەڵام الله خاوەنی شەفاعەتە و خاوەنی موڵکی هەموو ئاسمانەکان و زەویشە، وە لەپاشانیش تەنها هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە.

**بەڵگەی سێیەم:** هەروەها لە ئایەتێکی تردا الله تعالی دەفەرمووێت:
(وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ (١٢) وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاءُ وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ (١٣) ) (الروم)

واتە: لەو ڕۆژەدا کە کاتی زیندوو بوونەوەیە تاوانبارەکان بێ ئومێد دەبن لە ڕزگار بوونیان لە سزا، جا سەرسام دەمێنن و هیچ پەناو دەروازەیەکیان دەست ناکەوێت و بەڵگەیان نامێنێت.

هەروەها لەو ڕۆژەدا ئەو مەعبودانەی کە لە دونیا دەیان پەرستن و هاواریان دەکردنێ و ئومێدی شەفاعەت کردنیان پێیان بوو ـ بۆیە جۆرەها پەرستنیان بۆ دەکردن و کردبوویانن بە شەریك بۆ الله لە پەرستن و پشت پێ بەستندا ـ لەو ڕۆژەدا شەفاعەتیان بۆ ناکەن و نابن بە شەفاعەتکاریان بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبن بە دوژمنیان و بەڕائەتی خۆیان دەردەبڕن لەو هاوبەشی پەیداکەرانەی کە لە دونیادا هاواریان دەکردنێ و کردبوویانن بە شەفاعەتکار و شەریکی الله؛ چونکە شەفاعەت موڵکی الله یەو نابێت بکرێتە موڵکی غەیری ئەو.

جا کە هاوبەشی پەیداکەران بێ ئومێد بوون لە مەعبودەکانیان و بینیان بەڕائەتیان لێ دەکەن ئەو کاتە ئەوانیش بەڕائەت لە مەعبودەکانیان دەکەن و دەڵێن: ئێمە لە دونیا ئێوەمان دەپەرست و پشتمان پێ دەبەستن بۆ ئەمڕۆ، بۆ ئەوەی شەفاعەتمان بۆ بکەن، نەك بەڕائەتمان لێ بکەن. !

کەواتە بەم ئایەتە قورئانیانە ڕوون بۆوە کە شەفاعەت تەنها موڵکی الله یەو، تەنها دەبێت لەو داوا بکرێت، جا هەر کەسێك ئیعتیقادی وابێت یەکێکی تر غەیری الله شەفاعەتی بەدەستە و داوای شەفاعەت لەو

بکات بۆ ئەوەی شەفاعەتی بۆ بکات لای الله بێ ئیزنی الله ئەوا شەریکی بۆ الله داناوە لەچەند لایەنێکەوە:

١- لەو ڕوانگەوە کە شەفاعەت تەنها موڵکی الله یەو بە حەقی یەکێکی تری دەزانێت جگە لە الله. واتە وا دەزانێت کە شەفاعەتکارەکانی شەفاعەت کردنیان بەدەستە و بێ ڕووخسەتی الله ش شەفاعەتی خۆیان هەر دەکەن لای الله.

٢- لە ڕوانگەی داوا کردنی شەفاعەت لە غەیری الله؛ چونکە داواکردن و هاوار کردنە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانی غائیب، یان مردوو شیرکە و نابێت هاوار بکرێتە غەیری الله و داوا لە غەیری ئەو بکرێت چونکە کەسی ئەنجامدەر پێی کافر دەبێت.

٣- لە ڕوانگەی تەشبیە کردنی پەروەردگار بە پادشا و کار بەدەستانی دروست کراو واتە چۆن شەفاعەتکاران شەفاعەتی خۆیان دەکەن لای کاربەدەستان بێ ئەوەی کار بەدەستەکە پێشی خۆش بێت، وە بێ ڕووخسەتی ئەوانیش شەفاعەتی خۆیان هەر دەکەن و کار بەدەستانیش ناچارن وەڵامیان بدەنەوە و تکایان بگرنەوە، جا لە خۆشی بێت یان لە

ناخۆشی ! چونکە زۆربەی کات وایە کە شەفاعەتکاران مافێکیان هەیە بەسەر کاربەدەستەوە چونکە شەفاعەتکاران:

أ ـ یان ئەوانیش کار بەدەستن و خاوەن موڵکن لەلایەکی ترەوە.

ب ـ وە یان لەگەڵ خودی ئەم کاربەدەستە شەریکن لە موڵکایەتی.

ج ـ وە یان شەریکی نین لە موڵکدا بەڵام جێگر و یاریدەدەرینی.

بۆیە کاربەدەست ناتوانێت شەفاعەتیان نەگرێتەوە، چونکە جاری وا هەیە خۆی ئیشی بەو شەفاعەتکارانە دەبێت و ئەگەر ئیشیان نەکات ئەوانیش لێی هەڵدەگەڕێنەوە و لــەوانـەیـە زەرەری پێ بگەیەنن، هەروەها جاری وا هەیە مەترسی هەیە لێیان، بۆیە ناچارە ڕەتیان نەکاتەوە، هەروەها جاری واش هەیە چاکە و منەتی شەفاعەتکاری زۆر لەسەرە بۆیە بە پێویستی دەزانێت پاداشتی بداتەوە و تکایەکەی گیرا بکات.

جا لە بنەڕەتدا شەفاعەت بۆیە دەکرێت کە کار بەدەست و حاکم واز لە حوکمە دادپەروەریەکە بهێنێت و، حوکمەکە بەسەر شەفاعەت بۆ کراو تەتبیق نەکات لەبەر خاتری شەفاعەتکار.

کەواتە شەفاعەتکار دەتوانێت ڕاو حوکمی حاکم بگۆڕێت، چونکە مافی بەسەر حاکمەوە هەیە.

بەڵام الله تعالی زۆر لەوە بەرزترە کە تەشبیە بکرێت بە حاکمێکی دروست کراو (مخلوق)، هەروەها الله تعالی کەس ناتوانێت حوکمی

پێ بگۆڕێت و کاریگەری تێ بکات، هەروەها لەکەسیش ناترسێت و منەتی کەسیشی بەسەرەوە نییە و ئیشیشی بەکەس نییە وە هیچ کەسێکیش نییە خاوەنی هیچ بێت لە بوونەوەردا و کێشی مێرووولەیەکی بچوك مولکی هەبێت سەربەخۆ، یان شەریکی الله بێت لە مولکایەتیدا یان یاریدەدەری بێت. هەروەها لەوەش زیاتر کەس ناتوانێت شەفاعەتیشی لا بکات بێ ئیزنی الله.

**بەڵگەی چوارەم:** (وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ) (الأنعام: ٩٤)

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا الله تعالی بە هاوبەشی پەیداکەران دەفەرموێت: سوێند بە الله، بێگومان ئێوە بە تاك تاك گەڕانەوە لای ئێمە، هەروەکو یەکەمجار دروستمان کردن، جا هەرچی پێمان بەخشیبوون و لەبەردەستتان دابوو بەجێتان هێشت دوای خۆتان، هەروەها ناشبینین لەگەڵتان شەفاعەتکارەکانتان؛ ئەو فریشتە و جنۆکە و پێغەمبەر و پیاوچاکانەی ئیعتیقادتان پێیان بوو، هەروەها وا گومانتان دەبرد تکاتان بۆ بکەن و فریاتان بکەون کاتێ لەگەڵ الله دا هاوارتان دەکردنێ و کردبووتانن بە شەریکی الله لە ئیعتیماد خستنە سەر و هانا بۆ بردن و

داوا لێ کردن ! سوێند بە الله هەرچی پەیوەندیەك هەبوو لە نێوانتاندا پچڕا، جا هەرچی ئومێدێکتان پێیان بوو ون بوو و پێچەوانەش بۆوە.

## جۆری دووەم: شەفاعەتی شەرعی (الشفاعة الشرعية)

شەفاعەتی شەرعی ئەو جۆرە شەفاعەتەیە کە قورئان و حەدیس ئاماژەیان کردووە بە بوونی لە ڕۆژی قیامەتدا، جا مانای ئەم شەفاعەتەش ئەمەیە کە: (أَنَّ اللَّهَ هُوَ الَّذِي يَتَفَضَّلُ عَلَى أَهْلِ الْإِخْلَاصِ وَالتَّوْحِيدِ فَيَغْفِرُ لَهُمْ بِوَاسِطَةِ دُعَاءِ الشَّافِعِ الَّذِي أَذِنَ لَهُ أَنْ يَشْفَعَ لِيُكْرِمَهُ بِذَلِكَ وَيَنَالَ بِهِ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ) شيخ الاسلام ابن تيمية، (مجموع الفتاوى).

واتە: پەروەردگار (الله) خۆی ڕێز و چاکە و فەزڵ دەنوێنێ لەسەر ئەهلی ئیخلاس و تەنها الله پەرستدا، بەوەی کە لێیان دەبورێت بەهۆی دوعا و تکای ئەو تکاکارەی کە خۆی ڕوخسەتی داوە تکا بکات بۆ ئەوەی ڕێز بنێت لە تکاکار و بیگەیەنێت بە پلەی سوپاس کراو بەهۆی تکا کردنەکەی.

هەروەها ئەم ڕوخسەت دانی شەفاعەت کردنەش ڕەحمی الله یە بۆ شەفاعەت بۆ کراو و عەفوو کردنیەتی. کەواتە الله هەر تەنها خۆی

سوپاس کراوە لەسەر ئەم ڕوخسەت دانی تکا کردنە، جا هەر خۆیشی ئیزنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەدات شەفاعەت بکات بۆ ئەوەی بگات بە پلەی بەرزی سوپاس کراو.

کەواتە لە ڕۆژی قیامەتدا جۆرێك لە شەفاعەت هەیە کە دوو مەرجی تێدا بێت:

١ - پەروەردگار (الله) شەفاعەتکار ئیزن بدات بۆ شەفاعەت کردن؛ چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت بەبێ ئیزنی ئەو لە خۆیەوە شەفاعەت بکات وەك لای سەرکردە و کاربەدەستان دەکرێت ! جا الله تعالی دەفەرموێت: {مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ} [البقرة ٢٥٥].
واتە کێیە ئەوەی شەفاعەت دەکات لای پەروەردگار ئیللا بە ئیزنی خۆی نەبێت ؟!.

٢ - مەرجی دووەمی شەفاعەتی شەرعی ئەوەیە: کە ئەو کەسەی شەفاعەت کار شەفاعەتی بۆ دەکات دوای ئیزنی الله، کەسێك بێت الله بیەوێت شەفاعەتی بۆ بکرێت و ڕازیش بێت لە قسە و کردەوەی.
وەك الله تبارك وتعالی دەفەرمووێت: {بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا

خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾} [الأنبياء].

واته: فریشته‌كانی الله هه‌رچه‌نده له الله نزیكن، به‌ڵام ڕۆڵه و شه‌ریكی الله نین و خاوه‌نی هیچ نین له‌گه‌ڵ په‌روه‌ردگاردا، به‌ڵكو به‌نده‌ی ڕێز لێ گیراون. چونكه پێش په‌روه‌ردگاریان ناكه‌ون به هیچ قسه‌یه‌ك، هه‌روه‌ها به‌فه‌رمانی ئه‌و كارده‌كه‌ن و له خۆیانه‌وه شت داناهێنن و چاوه‌ڕێی فه‌رمانی ئه‌ون، هه‌روه‌ها په‌روه‌ردگار ڕابردوو و داهاتوویان ده‌زانێت و ناتوانن شه‌فاعه‌ت بكه‌ن ته‌نها بۆ ئه‌و كه‌سه نه‌بێت كه الله خۆی لێی ڕازییه، وه فریشته‌كانیش له ترسی الله له ترس و له‌رزدان.

كه‌واته هه‌رچه‌نده شه‌فاعه‌ت ده‌كه‌ن به‌ڵام ناتوانن به‌بێ ئیزنی ئه‌و بیكه‌ن؛ چونكه {لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ} پێش الله ناكه‌ون، هه‌روه‌ها شه‌فاعه‌ت كردنه‌كه‌شیان هه‌ر به فه‌رمانی الله یه‌؛ چونكه {وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ} واته به فه‌رمانی الله كارده‌كه‌ن.

هه‌روه‌ها شه‌فاعه‌تیش ته‌نها بۆ كه‌سێك ده‌كه‌ن كه الله بیه‌وێت بۆی بكه‌ن و لێی ڕازی بێت. جا له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا له الله ده‌ترسن و خۆیان به خاوه‌نی هیچ دانانێن له به‌رامبه‌ر الله.

هه‌روه‌ها (ابن كثیر) له ته‌فسیری ئه‌م ئایه‌ته ده‌فه‌رموێت: (فإذا كان هذا في حقِّ الملائكة المقربين، فكيف ترجون أيها الجاهلون شفاعة هذه الأنداد عنداللهِ؛ وهولم يشرع عبادتها ولا أذِنَ فيها، بل قد

نهى عنها على ألسنة جميع رُسُلهِ؛ وأنزل بالنهي عن ذلك جميعَ كُتُبهِ ؟!).

واته: جا كه ئەوە حاڵی ئەو فریشتانە بێت كە لە الله نزیكن و بەندەی خالیسی پەروەردگارن، وە لە عیبادەت و بە پاك ڕاگرتنی الله هیچی تر ناكەن، ئەدی كەوابوو چۆن ئێوەی نەفام دڵی خۆتان خۆش دەكەن بە شەفاعەتی كەسانێك، كە وەكو فریشتە نەپارێزراون لە هەڵە و تاوان، هەروەها سەرەڕای ئەوەش پەروەردگار مۆڵەتی ئێوەی نەداوە بە داواكردنی شەفاعەت لەو مردوو و پیاوچاكانە و هاواركردنە ئەوان و پەرستنیان، بەڵكو بە پێچەوانەوە نەهی كردووە لەم جۆرە شەفاعەت دانانە لە هەموو كتێبەكانی و لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەرەكانی.

هەروەها لە ئایەتێكی تردا هەردوو مەرجەكەی كۆكردۆتەوە دەفەرموویێت: {وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ ﴿٢٦﴾} [النجم].

قال الشوكاني (فتح القدير: ١٤٥/٥): والمعنى التوبيخ لهم بما يتمنون ويطمعون فيه من شفاعة الأصنام، مع كون الملائكة مع كثرة عبادتها وكرامتها على الله لا تشفع الا لمن أذن أن يشفع له، فكيف بهذه الجمادات

الفاقدة للعقل والفهم، وهو معنى قوله {إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ} لهم بالشفاعة {لِمَن يَشَاءُ} أن يشفع له {وَيَرْضَىٰ} بالشفاعة له،

لكونه من أهل التوحيد، وليس للمشركين في ذلك حظٌ، ولا يأذن الله بالشفاعة لهم ولا يرضاها، لكونهم ليسوا من المستحقين لها).

واتە: چەندین فریشتە لە ئاسمانەکان شەفاعەتیان هیچ سوودی نابێت، تەنها دوای ئەوە نەبێت کە: (١) الله ئیزنیان بدات شەفاعەت بکەن. (٢) بۆ ئەو کەسەی الله خۆی بیەوێت بۆی بکرێت. (٣) ڕازیش بێت شەفاعەتی بۆ بکرێت.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: {يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَـٰنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾} [طه].

واتە: لەو ڕۆژی قیامەتەدا شەفاعەت سوودی نابێت تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت الله شەفاعەتکاری ئیزن دابێت بۆ شەفاعەتکردن بۆی هەروەها لە وتەکەشی ـ واتە لە شەفاعەتەکەی ـ ڕازی بێت، جا ئەوانەش کە الله لێیان ڕازییە پێغەمبەران و پیاوچاکانن.

جا لە دوای ئەوەی کە زانیمان کەس شەفاعەتی بۆ ناکرێت تەنها ئەوە نەبێت کە الله بیەوێت بۆی بکرێت و لێی ڕازی بێت، ئایا الله تعالى بۆ کێ ڕازییە ؟

لە وەڵامدا: الله لەو کەسە ڕازییە کە دوو مەرجی بەیەکەوە بەستراوی تێدابێت:

١ـ تەنها الله پەرست و (مخلص) بێت، واتە نیەتی پاك و تاك بێت بۆ الله.

٢ـ هەروەها هیچ یەكێك و هیچ كەسێك نەكاتە شەریك بۆ الله لە هیچ جۆرێك لە جۆرەكانی پەرستندا.

**بەڵگەی یەكەمی ئەم دوو مەرجەش:** الله سبحانه وتعالى فەرموویەتی: {وَلَا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾} [الزخرف].

**تەفسیرەكانی ئەم ئایەتە:**

**تەفسیری یەكەم:** (ولا يملك عيسى وعزيرٌ والملائكةُ الشفاعة في أحدٍ (أو لِأحد) إلا فيمن (أو لمن) شهد بالحق (أي بالتوحيد) وآمن على علمٍ وبصيرةٍ بما شَهِدَ به).

واتە: عیسا و عوزەیر و فریشتەكان، شەفاعەتیان پێ ناكرێت بۆ كەس، تەنها بۆ ئەوانە نەبێت كە شاهیدیان داوە بە تەوحید و، ئیمانیان هێناوە لەسەر عیلم و زانیاری و تێگەیشتنەوە.

## کەواتە شەفاعەت ناکەن بۆ دوو کۆمەڵ:

١ـ ئەوانەی شاهیـدی نادەن بە (حـەق) واتە بە (لا إله إلا الله) کە کافرو موشریکن.

٢ـ ئەوانەی شاهێدی دەدەن بە دەمیان بە (لا إله إلا الله)، بەڵام نازانن ماناکەی بریتییە لەوەی کە: (هیچ پەرستراوێکی حەق نیە و، تەنها (الله) پەرستراوی حەقە و، پێویستە پەرستن و خۆشویستن و ترسان و ئیعتیقاد پێ بوون و هاوارکردن و داوا لێ کردن و پشت پێ بەستن و سەربڕین و ماڵ بەخشین، بۆ ئەو (الله)یە بکەن بە تەنها، بێ ئەوەی بۆ کەسی تری بکەن).

ئەم کۆمەڵی دووەمە، ئەگەر نوێژیش بکەن و ڕۆژووش بگرن و حەجیش بکەن، هەروەها شاهێدیش بدەن بە دەم بە (لا إله إلا الله) سوود لە شاهێدی و عیبادەتەکانیان نابینن، و شەفاعەتیشیان بـۆ نـاکـرێت، چونکە شاهێدی دانەکەیان تەنها بە دەمە و، مانای شاهێدیەکە نازانن و، لە دڵدا ئیعتیقادیان بە ماناکەی دانەمەزراوە؛ چونکە ئیعتیقادیان بە غەیری الله ش هەیە و، بە ئیعتیقاد و کردەوەیان شاهێدی دانەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە و، هاوار دەکەنە غەیری الله و، سەربڕین بۆ غەیری الله دەکەن و، داوای بەفریاکەوتن لە غەیری الله

دەکەن و، داوا لە مردوو دەکەن شەفاعەتیان بۆ بکەن، وەك چۆن موشریکەکانی کۆن داوایان لێ دەکردن. !!

{ **چونکە: (أ) شیرك عیبادەت هەڵدەوەشێنێتەوە:** {وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾} [الزمر]، {وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾} [الأنعام].

**(ب) جا لەگەڵ نەبوونی عەقیدەی (الله بەتەنها پەرستی) عیبادەت سوودی نابێت:** {وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ ۗ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٣٩﴾} [النور]، {وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾}[الفرقان]، {وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾} [النساء]. }

**تەفسیری دووەم:** (لا يملكُ هولاءِ الذين اعتقدوا أن الملائكة أو الأصنام أو الجن أو الشياطين تشفعُ لهم . لا يملكُ هولاء العابدون من دون الله أن يشفع لهم أحد إلا من شهد بالحق أي لكن من شهد بالحق . يعني الموحدين . يملكون شفاعة الملائكة والأنبياء إذا أذن لهم اللهُ عز وجل، فإن من شهد بالحق يُشْفَعُ لهُ ولا يُشَفع لمشرك).

واتە: ئەوانەی کە ئیعتیقادیان هەیە بە فریشتە و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و بت و جنۆکە کە شەفاعەتیان بۆ بکەن، هەروەها هاوار دەکەنە ئەوان و داوای شەفاعەت لەوان دەکەن، ئەوانە چونکە غەیری الله دەپەرستن شەفاعەتیان بۆ ناکرێت، چونکە تەنها ئەوانە شەفاعەتیان بۆ دەکرێت کە شاهیدیانداوە بە تەنها پەرستراویێتی الله بە دڵ و گیان و دەشزانن تەنها الله شایستەی پەرستن و داوا لێ کردنە، بۆیە تەنها ئەو بڕوادارانە (دوای ئیزنی الله) بەر شەفاعەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و فریشتەکان دەکەون، کەواتە موشریك بەر شەفاعەت ناکەوێت هەرچەندە دڵی خۆی خۆش بکات لەدونیا بەو پێغەمبەر و پیاوچاکانەی کە داوای شەفاعەتیان لێ دەکات لە گۆڕەکانیاندا. !!

**تەفسیری سێیەم:** (لا يملك من يدعونه من دون الله من الأصنام والأنبياء والملائكة والأولياء والجن الشفاعة كما يزعمون أنهم يشفعون لهم، إلا من شهد بالحق (بالتوحيد) على علم وبصيرة بما شهدوا به؛ وهم المسيح وعُزير والملائكة، لِأنهم شَهدوا بالحق والوحدانية لله على بصيرة، فإنهم يملكون الشفاعة لمن يستحِقُّها).

واتە: هەموو ئەو پەرستراوانەی کە موشریکەکان دایان ناون بە شەفاعەتکار بۆ خۆیان و ئیعتیقادیان وایە شەفاعەتیان بۆ دەکەن ـ هیچ

کام لەم پەرستراوانەیان شەفاعەتیان پێ ناکرێت و، ڕێگایان پێ نادرێت شەفاعەتیان بۆ بکەن، تەنها ئەوانەیان نەبن کە شاهیدیانداوە بە (لا إله إلا الله) بە تێگەیشتنەوە، کە ئەمانەش (عیسا و عوزەیر و فریشتەکانن) تەنها ئەمانە و وێنەی ئەو الله بە تەنها پەرستانە ڕێگایان پێ دەدرێت شەفاعەت بکەن، بۆ ئەو کەسانەی شایستەن کە بڕوادارانی تەنها الله پەرستن (المُوحِّدون).

کەواتە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە هەرسێ جۆرە تەفسیرەکانیەوە بۆمان دەرکەوت کە:

(أ)- زۆربەی ئەوانەی خەڵکی ئیعتیقادیان پێیانە شەفاعەتیان بۆ بکەن، ناتوانن شەفاعەت بکەن؛ چونکە تەنها ئەو کەسە دەتوانێت شەفاعەت بکات کە {شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾} (الزخرف)

واتە: تەنها الله پەرست بێت و، لەسەر ڕۆشناییش بیپەرستێت، بەڵام ئەوانەی الله بەتەنها نەپەرستن و بیروباوەڕ و ئیعتیقادیان بە غەیری الله هەبێت، وەك زۆر لە جادووگەرەکانی ئەمڕۆ کە ئیدیعای زانینی غەیب دەکەن و، خۆیان بە پیرۆز دەزانن و ڕێگا بە خەڵکی دەدەن هاواریان بکەنێ و، قاچیان ماچ بکەن و، کڕنوشیان بۆ ببەن و، پاشە و پاش بگەڕێنەوە دواوە لە خزمەتیاندا و، سەربڕینیان بۆ بکەن، ئەوانە هەرچەندە نەفامەکانیان و زۆر لە خەڵکی ناتێگەیشتووی تریش بە

شەفاعەتكاریان دەزانن و داوای شەفاعەتیان لێ دەكەن؛ بەڵام لە ڕاستیدا نەك هەر ناتوانن شەفاعەت بۆ كەس بكەن، بەڵكو خۆشیان شەفاعەتیشیان بۆ ناكرێت؛ چونكە:

* شاهیدیان بە حەق بە (لا إله إلا الله) نەداوە بە تێگەیشتنەوە.
* هەروەها بە شیرك و كوفر شاهیدیەكەیان هەڵوەشاندۆتەوە، جا كەسێكیش شیركی هەبێت شەفاعەتی قەبوڵ نییە، چونكە مەرجی شەفاعەتكار ئەوەیە تەنها الله پەرست (موحد) بێت و شەریك بۆ الله دانەنێت لە پەرستندا، وەك ئایەتەكەی پێشوو بەڵگەیە لەسەر ئەمە بە گوێرەی لێك دانەوەی سێهەم.

هەروەها وەك لەم حەدیسەی بەڵگەی دووەمەشدا دەردەكەوێت:

**بەڵگەی دووەمی دوو مەرجەكە:** ((مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَ يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللَّهُ فِيهِ)) (صحيح مسلم)
واتە: هیچ موسڵمانێك نییە بمرێت و چل پیاوی الله بەتەنها پەرست كە هیچ شەریك بۆ الله دانەنێن نوێژی جەنازەی (صلاة الجنازة)ی لەسەر

بکەن ئیللا الله تعالى دوعا و نوێژ و تکایان قبوڵ دەکات بۆ ئەو موسڵمانە مردووە.

کەواتە ئەوەی نوێژی جەنازە دەکات و لە نوێژەکەیدا شەفاعەت و تکا دەکات لای الله بۆ مردوو ئەگەر شیرکی هەبێت ئەوە تکای ناگیرێتەوە.

* هەروەها هەر کەسێك ڕازی بێت خەڵکی هاواری بکەنێ و دوای مردنیشی داوای شەفاعەتی لێ بکەن، ئەوە نەك هەر شەفاعەت ناکات، بەڵکو طاغوتە و دەخرێتە ناو دۆزەخەوە بە بەردەوامی لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە دەیان پەرستن و هاواریان دەکردنێ.

* هەروەها هەموو ئەو جنۆکە شەیتانانەش، کە پەرستنی غەیری الله دەڕازێننەوە بۆ خەڵکی، لەژێر پەردەی شەفاعەتکاری و دۆستایەتی کردن و خۆشویستنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان، هەروەها ئەم جنۆکە شەیتانانەش بە قسەیان دەکرێت و گوێڕایەڵیان دەکرێت و هاواریان دەکرێتێ، ئەوانیش ناتوانن شەفاعەت بکەن و، بۆ ناو دۆزەخیش دەڕۆن.

* هەروەها هەموو ئەو بت و سەنەم و دار و بەردانەی کە خەڵکی بە پیرۆزیان دەزانن و ئیعتیقادیان پێیانە و ئومێدی شەفاعەت کردنیان پێیان هەیە؛ هەر هەموویان لەگەڵ شوێن کەوتەکانیان دەچنە ناو دۆزەخەوە ـ پەنا بە الله ـ وەك الله تعالى دەفەرموویێت: {إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ

اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَـٰؤُلَاءِ آلِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ أُولَـٰئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَـٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾} [الأنبياء].

واتە: ئەی موشریکەکان، ئێوەش و ئەوانەش کە دەتان پەرستن و هاوارتان دەکردنێ و داوای شەفاعەتتان لێ دەکردن جگە لە الله، جا ئەوانیش ڕازی بوون یان بێ دەنگ بوون لەسەر ئەم پەرستنەی ئێوە بۆ ئەوان ؟! هەردوولاتان سوتەمەنی دۆزەخن و دەچنە ناویەوە. جا ئەگەر ئەو پەرستراوانەی ئێوە شایستەی پەرستن و هاوار لێ کردن بان، ئێستا نەدەچوونە ناو دۆزەخەوە بەڵام ئێستا هەردوولاتان بە بەردەوامی تێیدا دەمێننەوە.

کەواتە ـ بێ عەقڵی و نەفامی و زەرەرمەندییە ـ موسڵمان ئیعتیقادی بە پەڕۆ، یان بەردێك، یان دارێکی سەر قەبری پیاوچاکێك بێت و، بە پیرۆزی بزانێت و وابزانێت لە زەرەر دەیپارێزێت و، سوودی پێ دەبەخشێت، یان باوەڕی بە کەسێکی خۆپەرست بێت شەفاعەتی بۆ بکات، بەداخەوە ئایا نازانن ئەمانە هەموویان بۆ ناو دۆزەخن و شەفاعەتیان پێ ناکرێت بۆخۆشیان. !!

خەڵكینە بیربكەنەوە و هۆشیار بنەوە ...

بەسیەتی لاسایی كردنەوەی كوێرانە و، بەندایەتی كردن بۆ بەندە.

(ب)ـ جا لە ئایەتەكەی سورەتی (الزخرف) بۆمان دەركەوت: كە تەنها ئەو كەسانە شەفاعەتیان بۆ دەكرێت، كە شاهیدیان داوە بە حەق واتە بە (لا إله إلا الله محمد رسول الله) بە تێگەیشتنەوە، نەك بە لاسایی كردنەوەی كوێرانە. هەروەها بۆمان دەركەوت كە ئەوانەی پەروەردگار لێیان ڕازیە و دەیەوێت شەفاعەتیان بۆ بكرێت ئەوانەن كە {شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ} الله بە تەنها دەپەرستن لەسەر ڕۆشناییەوە.

كەواتە تەنها ئەوانە شەفاعەتیان بۆ دەكرێت كە تەنها (الله) پەرستراو و خۆشەویستیان بوو. وە تەنها عیبادەتی الله یان كردووە بە خالیسی، هەروەها شەریكیان بۆ دانەناوە و، لە غەیری ئەو هاواریان نەكردۆتە كەس بۆ شەفاعەت كردن، وەك لە بەڵگەی سێهەمدا دەردەكەوێت:

**بەڵگەی سێیەمی دوو مەرجەكە:** أبو هريره (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: وتم ئەی پیغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم): ((مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟)) واتە: كێ بەختەوەرترین كەس دەبێت بە شەفاعەتی تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا ؟ ((فَقَالَ: أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ)) (صحيح مسلم) ،

فەرمووی: بەختەوەرترین کەس بە شەفاعەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە بڵێ: (لا إله إلا الله) واتە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە تەنها الله نەبێت هەروەها بە خالیسی لە دڵەوە ئەم شاهیدی دانە دەربچێت.

کەواتە ئەگەر وتنی (لا إله إلا الله) لە دڵێکی بە ئیخلاس و تەنها ڕوو لە الله و ئیعتیقاد بە الله بوو دەرنەچێت، سوودی نییە و، بەختەوەر نابێت بە شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

جا هەر کەسێك شەریك بۆ الله دابنێت و هاوار بکاتە غەیری الله و ئیعتیقادی بە غەیری الله بێت، ئەوە بەهیچ شێوەیەك بەر شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناکەوێت، وەك لە بەڵگەی چوارەمدا لەم حەدیسەدا دەردەکەوێت:

**بەڵگەی چوارەمی دوو مەرجەکە:** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ((لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ: مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا)) (صحيح مسلم)

واتە: بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوعایەکی گیرا (وەڵام دراوە) هەبووە. جا هەموو پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) دوعای خۆیان کرد و وەڵامیان وەرگرتەوە، بەڵام من دوعا گیرا بووەکەی خۆم هەڵگرتووە

(شاردوومەتەوە) بۆ تکا کردنی ڕۆژی قیامەت بۆ گەلەکەم، هەروەها تکاکەم (شەفاعەتەکەم) دەگات ـ إن شاء الله ـ بە هەموو یەکێك کە مردبێت و هیچ شەریکی بۆ الله پەیدا نەکردبێت واتە بە شیرکەوە نە مردبێت.

**بۆیە لەبارەی شەفاعەتەوە:** ئێمەی ئەهلی سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، و هاوەڵانی ـ الله لێیان ڕازی بێت ـ باوەڕی ڕاست و دروست و تەواومان هەیە بە دوعا و شەفاعەتی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم وە هەروەها دوعا و شەفاعەتی فریشتە و بڕوادارانیش، بەو شێوەیەی کە لە حەدیسی (صحیح)دا هاتووە:

پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم باسی ڕۆژی قیامەتمان بۆ دەکات، کە شەفاعەتکاران شەفاعەت دەکەن بۆ ئەو موسڵمانانەی دەچنە ناو دۆزەخەوە، بۆ هێنانە دەرەوەیان، جا الله تعالی ش شەفاعەتیان قەبوڵ دەکات، جا دوایی بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی ئەوانە دەردەهێنێت کە بەر شەفاعەت نەکەوتوون لە ئەهلی تەوحید، وەك پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: ((فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: شَفَعَتِ الْمَلاَئِكَةُ وَشَفَعَ النَّبِيُّونَ وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ، وَلَمْ يَبْقَ إِلاَّ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ،

فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ))
صحيح مسلم: (٤٧٢).

هەروەکو چۆن باوەڕمان بەوە هەیە کە لە ڕۆژی دواییدا خەڵکی دەچن داوا لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەکەن شەفاعەتیان بۆ بکەن و، شەفاعەت هەیە لەو ڕۆژەدا، بەهەمان شێوەش باوەڕی تەواویشمان هەیە بە شەرعیەتی داواکردنی دوعای خێر لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان تا لە ژیانی دونیادا مابن و نەمردبن، بۆ تێکڕای موسڵمانان. هەروەها چەندان بەڵگە هەیە لەسەر شەرعیەتی ئەم داوای دوعا کردنە ـ لە چاکەکارانی زیندوو، کە بچیتە لایان و داوایان لێ بکەیت دوعا بۆ موسڵمانان بکەن، نەك داوا لە پیاوچاکان بکەیت لە دوور و بێ ئاگاییانەوە.

## وەسیلەی شەرعی بۆ بەختەوەر بوون بە شەفاعەت:

دوای ئەوەی کە تێگەیشتین: داوای شەفاعەت بۆکردن لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و پیاوچاکان دوای مردنیان، دەبێتە ڕێگری شەفاعەت بۆ کردن.

هەروەها زانیمان تەنها موسڵمانی تەنها الله پەرست (الْمُوحِّد) شەفاعەتی بۆ دەكرێت.

با بزانین ئایا هیچ وەسیلەیەكی زیاتر هەیە كە بیگرینە دەست و ببێتە مایەی بەختەوەر بوون بە شەفاعەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، ئەگەر بڕواداری تەنها الله پەرست ئەم وەسیلەیەی داهاتوو بگرێتە دەست ئەوە ـ إن شاء الله ـ بە دڵنیاتر بەختەوەر دەبێت بە شەفاعەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) صحيح البخاري: (٦١٤).

واتە: هەركەسێك دوای بانگ بیستن بڵێت: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ) ئەوە بەر شەفاعەتی من دەكەوێت و الله دەمكاتە شەفاعەتكاری.

**تێبینی (١):** ئەم دوعایە دوای بانگە، وەك لە حەدیسەكەدا دەفەرموێت: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ) وە دروست نییە قیاسی قامەت بكرێتە سەر بانگ و دوای قامەتیش بگوترێت. !

**تێبینی (٢):** لەم دوعایەدا سێ بڕگە زیاد کراون کە بەڕاستی لە حەدیسەکەدا نەهاتوون:

بڕگەی: **(والدرجة الرفيعة العالية)** لەدوای **(الوسيلة والفضيلة)**.

بڕگەی: **(وارزقنا شفاعته وزيارته)** لەدوای **(وعدتَهُ)**.

بڕگەی: **(إنّك لا تخلف الميعاد)** لە کۆتاییدا.

ئەم سێ بڕگەیە لە حەدیسەکەدا نییە بە (صحیحی)، وە پابەند بوون بە خودی حەدیسەکە پێویستە و باشترە لە زیاد کردن لەسەری، چونکە دوعایە؛ دوعاش عیبادەتە؛ عیبادەتیش بەگوێرەی بەڵگەیە، نەك هەوای نەفس و عەقڵ و تەقلیدی کوێرانە.

کەواتە: موسڵمانی تەنها الله پەرست، سەرەڕای تەوحیدەکەت، کە بناغەی ئیسلامەتیتە، ئەم سەبەبەش بگرە دەست، بۆ ئەوەی بەر شەفاعەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بکەویت، بەڵام وریابە، نەکەیت ڕێگەیەکی داهێنراو بگریتەبەر، بە نیازی بەختەوەر بوون بە شەفاعەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

## * وعذاب القبر حق *

وه سزای ناو گۆڕ ڕاست و حەقە.

سزای ناو گۆڕ هەیە و سابتە بە بەڵگەی ڕاشکاوی سوننەت و قورئان و یەکدەنگی زانایانی ئیسلام کە ئەمەش سێ بەڵگەیە:

سەبارەت بە فەرموودەی ڕاشکاو لەم بارەیەوە: پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرموویێت: ((تعوذوا بالله من عذب القبر، تعوذوا بالله من عذاب القبر، تعوذوا بالله من عذاب القبر)) أخرجه مسلم، كتاب الجنة، باب عرض مقعد الميت من الجنة (٢٨٦٧).

واتە: پەنا بگرن بە الله لە سزای گۆڕ، پەنا بگرن بە الله لە سزای گۆڕ، پەنا بگرن بە الله لە سزای گۆڕ.

وە لە حەدیسی سەحیح هاتووە کە دوو تاوان مرۆڤ تووشی سزای ناو گۆڕ دەکەن: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (الله لێی ڕازی بێت لێبێت) قَالَ : أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) مَرَّ بِقَبْرَيْنِ ، فَقَالَ : ((إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَنْزِهُ مِنَ بَوْلِهِ ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بَيْنَ النَّاسِ بِالنَّمِيمَةِ)) صحيح البخاري رقم : (٢١٦) وصحيح مسلم رقم : (٦٧٥).

واتە : پێغەمبەر (ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی: بەڕاستی هەردووکیان سزا دەدرێن، جا سزاش نادرێن لەبەر شتێك کە بە

گەورەیان دانابێت، یەکێکیان خۆی پاك ڕانەدەگرت (خۆی نەدەپاراست) لە میزەکەی، وە ئەوەی تریان قسەی لە نێوان خەڵکدا دەهێنا و دەبرد بە مەبەستی زیان گەیاندن.

هەروەها یەکدەنگی زانایانیش لەو بارەیەوە، لەبەر ئەوەی هەموو موسڵمانان لە نوێژەکانیاندا دەڵێن: ((أعوذ بالله من عذاب جهنم، ومن عذاب القبر)) تەنانەت ئەو خەڵکانەشی کە عامین و ئەهلی عیلم و ئیجماع نین هەر ئەوە دەڵێن.

سەبارەت بە قورئانیش الله جله جلاله دەربارەی ئالی فیرعەون دەفەرموویێت: (النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ) (غافر: ٤٦)

واتە: لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن بە بەیانی و نیوەڕۆ بەدواوە، ئەمەش هەر لە گۆڕەوە تا قیامەت: (( عن عائشة -رضى الله عنها-: أن يهودية دخلت عليها فقالت: نعوذ بالله من عذاب القبر، فسألت عائشة رسول الله (صلى الله عليه و سلم) عن عذاب القبر فقال (صلى الله عليه و سلم) ((نعم عذاب القبر )) ئیمامی بوخاری لە خاتوو عائیشەوە - الله لێی رازی بێ - لە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پرسی: دەربارەی سزای گۆڕ ؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ سزای گۆڕ ڕاستە و حەقە، ئیتر هەموو جارێك پاش نوێژەکان ((اللهم إنى أعوذ

بك من عذاب القبر)) ی دەگوت. دەتوانن لە تەفسیری ئەم ئایەتە سەیرێکی تەفسیری (ابن كثير) بكەن، چونكە فەرموودەیەكی زۆری هێناوە دەربارەی سزای گۆڕ.

(ويوم تقوم الساعة) و ڕۆژێكیش قیامەت بەرپا دەبێت، الله بە فریشتەكان دەفەرمویَ: (أدخلوا آل فرعون أشد العذاب) ئال و شوێنكەوتووانی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە، ئەمەیە كە خوا نەناس و كافر سوود وەردەگرێت لەكارو كردەوەی چاكی خۆی، لە دونیا و لەقیامەتدا ! لە دونیادا الله بە ماڵ و سامان و كوڕ و منداڵ و لەش ساغی و تەندروستی پاداشتی دەداتەوە، لە قیامەتیشدا كەمتر لەو سزایەی (ئالی فیرعەون)ی هەیە.

جا ئەم ئایەتەش بنەوا و بەڵگەیەكە لەسەر سەلماندن و جێگیركردنی سزای ناوگۆڕ . ئەو تووشبوونەشیان بە ئاگر و پیشاندانی ئاگرەش بۆ ڕزگاربوونیان نییە لە ئاگر بەڵكو بۆ ئەوەیە كە لە سزاكەی بچەژن و ئازار بدرێن، جا الله تبارك وتعالى دەفەرموویێت: ( وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنْفُسَكُمُ) (الأنعام: ٩٣)

واتە: ئەگەر ـ ئەی پەیامبەری الله ﷺ ـ حاڵ و باری ئەو لە سنوور دەرچووانە لە كاتی دژواریەكانی گیان كێشاندا دەبینیت ئەوا بەڕاستی دیمەنێكی سەیر و سامناك دەبینی ، لەو كاتەدا فریشتەكانی ڕۆح

کێشان دەستیان بۆ درێژ دەکەن و سزایان دەدەن و پێیان دەڵێن : گیانی خۆتان دەربکەن. الله أکبر ئەوانە لەکاتی گیان کێشاندا بەخیل دەبن بۆ ڕۆحی خۆیان و نایانەوێت دەربچێت.
دوای ئەوە الله سبحانه وتعالی دەفەرموویت: (الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنْتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنْتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ) (الأنعام: ٩٣)
واتە: ئەمڕۆ ئەوپەڕی ڕیسوایی و سەرشۆڕی دەبینن، وەکو چۆن لە دونیادا درۆتان لەگەڵ الله دا دەکرد، و لووت بەرز و خۆ بەزلزان بوون لە شوێنکەوتنی ئایەت و نیشانەکانی، و ملکەچ بوونتان بۆ پەیامبەرانی ـ علیهم الصلاة والسلام ـ .
جا لە ئایەتەکەدا فەرمووی: (اليوم) کە (ال)ی پێوەیە کە لە زماندا پێی دەگوترێ (للعهد الحضوري) واتە ئەو ڕۆژەی کە ئامادەیە و بریتییە لە ڕۆژی مردنیان.
کەوابوو سزای ناوگۆڕ سابتە و بوونی هەیە بە فەرموودەی ڕاشکاو و ظاهری قورئان و یەکدەنگی موسڵمانان، وە ئەم ظاهرەی قورئانیش نزیکە ببێت بە ڕاشکاو چونکە ئەو دوو ئایەتەی کە باسمان کردن وەکو ڕاشکاو وەهان لەو بابەتەدا.

## * ومنكر ونكير حق *

مونکەڕ و نەکیر دوو فریشتەی ناو گۆڕن ڕاست و حەقن.

الله عز وجل دەفەرموویّت: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ) (ابراهيم: ٢٧)

واته: جا ئەوانە کە باوەڕیان بە الله و بە گشت بڕیارەکانی الله هێناوە، بەهۆی ئەم وشە جێگر و نەگۆڕاوەی ( لا إله إلا لله )وە الله پێگەیان قایم و تابت دەکات (فى الحياة الدنيا وفى الآخرة) لە ژیانی ئەم دونیا و، لە ژیانی ئەو دونیا (ويضل الله الظالمين) وە ستەمکارانیش گومڕاو سەرلێشێواو دەکات (ويفعل الله ما يشاء) جا الله بیەوێ هەر شتێ بکات، زۆر بە ئاسانی دەیکات، حەز بکات کێ ڕێنموونی بکاو، کێیش گومڕاو سەرلێشێواو بکا، ئەمانە هەموو لە دەسەڵاتی ئەودان.

پێشەوا (بوخاری) ئەم فەرموودەیە دێنێت و دەڵێت: موسڵمان هەر کە خرایە گۆڕەوە و پرسیاری لێکرا، خێرا بەهۆی ڕاستی دنیایەوە شایەتمانێکی ڕاست و بە هەق دێنێ، مەبەستیش بەم ئایەتە کە الله تعالی دەفەرموویّت: (يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت ..) هەر ئەمەیە، بۆیە لەو کاتە ناسك و تەنگەدا وەڵامی پرسیارەکانی گۆڕی بۆ ئاسان دەکات و، لە گشت گرفتەکان دەیپارێزێت. بەڵام مرۆڤی لارو

لاسارو الله نەناس کە خرایە گۆڕەوە و پرسیارەکانی لێکرا، دەحەپەسێ و وەکو شێتی لێدێ و هیچ نازانێ و سەرگەردانە.
(الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ) الله لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت:
لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەرچووین بۆ شوێنکەوتنی جەنازەی پیاوێکی ئەنساری، جا گەیشتینە لای گۆڕەکەی و هێشتا ئەلحەدەکەی نەکەنرا بوو، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دانیشت و ئێمەش بە دەوریدا دانیشتین، ئەوەندە هێمن و بێ دەنگ بووین وەکو ئەوەی کە باڵندە بە سەر سەرمانەوە نیشتبێتەوە، چیلکە دارێك بە دەستی پێغەمبەرەوە بوو ﷺ دەیکرد بە زەویدا، ئینجا سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: پەنا بگرن بە الله لە سزای گۆڕ (دوو جار یان سێ جار).
ئینجا فەرمووی : بەڕاستی بەندەی ئیماندار ئەگەر گەیشتە کاتی دابڕان لە دونیا و ڕووکردن لە دوارۆژ هەندێك فریشتەی ڕوومەت سپی ڕوومەتیان وەکو خۆر وایە لە ئاسمانەوە دادەبەزن بۆ لای، کفنیان پێیە لە کفنی بەهەشت، هەروەها بۆنی خۆشیان پێیە لە بۆنی بەهەشت، جا لە لایدا دادەنیشن تاوەکو چاو بڕ بکات، ئینجا فریشتەی گیان کێشان (سەلامی الله ی لێبێت) دێت تاوەکو لە لای سەریەوە دادەنیشێت و پێی دەڵێت: ئەی گیانە پاکەکە وەرە دەرەوە بۆ لای لێخۆشبوون و ڕازیبوونی الله .

فەرمووی: گیانی دێتە دەرەوە و دادەچۆرێت هەروەکو چۆن دڵۆپە ئاوێك لە دەمی کونەیەکەوە دادەچۆرێت، ئینجا فریشتەی گیان کێشان گیانەکە دەبات، جا ئەگەر بردی فریشتەکانی تر کە بە دەوریدا دانیشتوون بە ئەندازەی چاو تروکاندنێك نایهێڵن بە دەستیەوە تاوەکو لێی وەردەگرن و یەکسەر دەیخەنە نێو ئەو کفنەوە و ئەو بۆنە خۆشەوە، ئەوەش ئەوەیە کە الله تعالی لە بارەیەوە دەفەرمووێت: (تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لا يُفَرِّطُونَ) [فریشتە نێردراوەکانمان گیانی دەکێشن و کەمتەرخەمی ناکەن]، جا بۆنێکی خۆشی لێ دێتە دەرەوە وەك خۆشترین بۆنی میسك کە لەسەر ڕووی زەویدا هەبووبێت .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کاتێك ڕۆحەکەی دەردەچێت هەموو فریشتەکانی نێوان ئاسمان و زەوی و هەموو فریشتەکانی نێو ئاسمان نوێژی لەسەر دەکەن، و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە، و سەرپەرشتیارانی هیچ دەرگایەك نییە ئیللا لە الله دەپاڕێنەوە کەوا ڕۆحەکەی بە لای ئەواندا بەرز بکرێتەوە.

فەرمووی: ئینجا دەیبەنە سەرەوە بۆ ئاسمان و ئەو ڕۆحە تێناپەڕێنن بە لای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا ئیللا دەڵێن: ئەوا ئەم ڕۆحە پاکە هی کێیە ؟

ئەو فریشتانەش کە ڕۆحەکەیان پێیە دەڵێن: ئەمە ڕۆحی (فلان)ی کوڕی (فلان)ـە، ناوی دەبەن بە جوانترین ناوی کە لە دونیادا ناویان پێی دەبرد.

تاوەکو دەیگەیەننە ئاسمانی دونیا، داوا دەکەن دەرگای ئاسمانی بۆ بکرێتەوە، دەرگایان بۆ دەکرێتەوە، ئینجا فریشتە نزیکەکانی هەموو ئاسمانێك شوێنی ئەو ڕۆحە دەکەون بۆ ئەو ئاسمانەی کە بە دوایدا دێت تاوەکو دەیگەیەننە ئاسمانی حەوتەم، ئینجا الله تعالی دەفەرموێت: کتێبی بەندەکەم لە (علیین)دا بنووسن **[**تۆ چوزانیت **(عِلِّيُّونَ)** چییە ؟ کتێبێکی نووسراوە ، بەندە نزیکەکانی الله ئامادەی دەبن**]** **{**سورة: المطففین**}**، جا کتێبەکەی لە کتێبی بەرزدا دەنووسرێت ، ئینجا الله تعالی دەفەرمووێت: ڕۆحەکە بگێڕنەوە بۆ زەوی چونکە بەڕاستی من بەڵێنم پێ داون کە بەڕاستی من لەو زەویە دروستیانم کردووە و دەشیان گێڕمەوە بۆ ناوی و جارێکی تریش لە زەوی دەریان دەهێنمە دەرەوە .

فەرمووی: ئینجا دەیگەڕێننەوە بۆ زەوی، ئینجا ڕۆحەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ناو لاشەکەی، فەرمووی: بەڕاستی گوێی لە دەنگی تەپەی پێلاوی شوێنکەوتووانی جەنازەکەی دەبێت لە کاتێکدا کە پشتی لێدەکەن و بەجێی دەهێڵن و دەگەڕێنەوە.

ئینجا دوو فریشتەی (تووند ڕاچڵەکێنەر) دێن بۆ لای و ڕایدەچڵەکێنن و دایدەنیشێنن.

فَيَقُولاَنَ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: کێ پەروەردگارتە ؟

فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ.

ئەویش دەڵێت: پەروەردگارم (الله)یە.

فَيَقُولاَنَ لَهُ: مَا دِينُكَ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: ئایینت چییە ؟

فَيَقُولُ: دِينِيَ الإِسْلاَمُ.

ئەویش دەڵێت: ئیسلام ئایینمە.

فَيَقُولاَنَ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کێیە کە لە نێوتاندا نێردرابوو ؟

فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ .

ئەویش دەڵێت: پێغەمبەری الله یە ﷺ .

فَيَقُولاَنَ لَهُ: وَمَا عِلْمُكَ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: چۆن زانیت ؟

فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللَّهِ فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ.

ئەویش دەڵێت: کتێبەکەی الله م (قورئانم) خوێندەوە و باوەڕم پێهێنا و بەڕاستم زانی.

ئینجا بانگکارێك بانگ دەکات لە ئاسمانەوە: بەندەکەم ڕاستی کـــرد، ڕایخـــەن بۆی لە فەرشـی بەهەشـــت، بیپـۆشن لە پۆشاکی بەهەشت، دەرگایەکی بۆ بکـــەنەوە بەرەو بەهەشت.

فەرمووی: لە خۆشی و بۆنی بەهەشتی بۆ دێت، و گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێتەوە تاوەکو چاو بڕ بکات.

فەرمووی: پیاوێکی ڕوومەت جوانی پۆشاك جوانی بۆن خۆشی بۆ دەنوێنرێت و دێت بۆ لای و پێی دەڵێت: مژدەت لێبێت بەوەی کە پێت خۆشە، مژدەت لێبێت بە ڕەزامەندی الله و باخانێك لە بەهەشتدا کە خۆشگوزەرانی بەردەوامی تێــدایــــە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێی دەدرا.

ئەویش پێی دەڵێت: تۆش الله موژدەی خێرت بداتێ، تۆ کێیت ؟ ڕوومەتت ڕوومەتێکە خێر و خۆشی دێنێت.

ئەویش دەڵێت: من کردەوە چاکەکانتم، سوێند بە الله بە تۆم نەزانیوە ئیللا ئەوە نەبێت کە پەلە و دەست پێشخەریت کردووە لە گوێڕایەڵی الله دا و لەسەرخۆ و خاویش بوویت لە سەرپێچی کردنی الله دا، الله پاداشتی خێرت بداتەوە.

ئینجا دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لە بەهەشتەوە و دەرگایەکیشی بۆ دەکرێتەوە لە دۆزەخەوە و پێی دەگوترێت ئەمە جێگاکەت بوو لە

دۆزەخدا ئەگەر سەرپێچی الله ت بکردایە، الله گۆڕیویەتیەوە بۆت بەم جێگایە لە بەهەشتدا.

جا ئەگەر ئەوەی بینی کە لە بەهەشتدایە دەڵێت: پەروەردگارم هاتنی ڕۆژی قیامەت پێش بخە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای ماڵ و کەس و کارم.

پێی دەگوترێت: ئارام بگرە.

## (ئەمەی سەرەوە تایبەت بوو بە موسڵمان)

**بەڵام سەبارەت بە کافر و بێ باوەڕ فەرمووی:** بەڕاستی بەندەی کافر (لە ڕیوایەتێکی تردا: خراپەکار) ئەگەر گەیشتە کاتی دابڕان لە دونیا و ڕووکردن لە دوارۆژ هەندێك فریشتەی (توووند و تیژ) لە ئاسمانەوە دادەبەزن بۆ لای ڕوومەتیان ڕەشە و کفنیان پێیە لە ئاگر، لە لایدا دادەنیشن تاوەکو چاو بڕ بکات، ئینجا فریشتەی گیان کێشان دێت تاوەکو لە لای سەریەوە دادەنیشێت و پێی دەڵێت: ئەی گیانە پیسەکە وەرە دەرەوە بۆ لای خەشم و قین و تورەیی الله.

فەرمووی: ڕۆحەکەی بە لاشەیدا بڵاودەبێتەوە و فریشتەی گیان کێشانیش ڕایدەکێشێتە دەرەوە هەروەکو چۆن شیشێکی زۆر قولاپدار

له خوریه‌كی ته‌ڕدا ڕابكێشرێت (له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا هه‌موو ده‌مار و ڕه‌گ و ماسولكه‌كانی پارچه پارچه ده‌بێت و ده‌بڕێن).

ئینجا فریشته‌ی گیان كێشان گیانه‌كه ده‌بات، جا ئه‌گه‌ر بردی فریشته‌كانی تر كه به ده‌وریدا دانیشتوون به ئه‌ندازه‌ی چاو تروكاندنێك نایهێڵن به ده‌ستیه‌وه تاوه‌كو لـێی وه‌رده‌گـرن و یه‌كسه‌ر ده‌یخه‌نه ناو ئه‌و كفنه ئاگریـــنه‌وه، بۆنێكی گه‌نیوی لـێ دێته ده‌ره‌وه وه‌ك گه‌نیوترین بۆنی لاكێكی تۆپیو كه له‌سه‌ر ڕووی زه‌ویدا هه‌بووبێت.

ئینجا ده‌یبه‌نه سه‌ره‌وه بۆ ئاسمان و ئه‌و ڕۆحه تێناپه‌ڕێنن به لای هیچ كۆمه‌ڵه فریشته‌یه‌كدا ئیللا ده‌ڵێن: ئه‌وا ئه‌م ڕۆحه پیسه هی كێیه ؟

ئه‌و فریشتانه‌ش كه ڕۆحه‌كه‌یان پێیه ده‌ڵێن: ئه‌مه ڕۆحی (فلان)ی كوڕی (فلان)ـه، ناوی ده‌به‌ن به ناشیرین ترین ناوی كه له دونیادا ناویان پێی ده‌برد.

تاوه‌كو ده‌یگه‌یه‌ننه ئاسمانی دونیا، داوا ده‌كه‌ن ده‌رگای ئاسمانی بۆ بكرێته‌وه، ده‌رگای بۆ ناكرێته‌وه، ئینجا پێغه‌مبه‌ری الله ﷺ ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه: [لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ]. (ده‌رگاكانی ئاسمان ناكرێته‌وه بۆ بێباوه‌ڕان و ناشچنه ناو به‌هه‌شته‌وه تاوه‌كو وشتر نه‌چێت به كونه ده‌رزیدا).

هه‌موو فریشته‌كانی نێوان ئاسمان و زه‌وی و هه‌موو فریشته‌كانی نێو ئاسمان له‌عنه‌تی لێده‌كه‌ن، جا ده‌رگاكانی ئاسمانی لـێ داده‌خرێت،

سەرپەرشتیارانی هیچ دەرگایەك نییە ئیللا لە الله دەپارێنەوە کەوا ڕۆحەکەی بە لای ئەواندا بەرز نەکرێتەوە.

ئینجا الله تعالی دەفەرمووێت: کتێبەکەی لە (سجین)دا لە خواروترین تەبەقەی زەویدا بنووسن، ئینجا الله تعالی دەفەرمووێت: ڕۆحەکە بگێڕنەوە بۆ زەوی چونکە بەڕاستی من بەڵێنم پێ داون کە بەڕاستی من لەو زەویە دروستیانم کردووە و دەشیان گێڕمەوە بۆ ناویی و جارێکی تریش لە زەوی دەریان دەهێنمە دەرەوە.

ئینجا ڕۆحەکەی لە ئاسمانەوە فڕێ دەدرێتە خوارەوە تاوەکو دەکەوێتە ناو لاشەکەی، ئینجا پێغەمبەری الله ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: [وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنْ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ ] (هەر کەسێك هاوبەش (شەریك) بۆ الله ئەنجام بدات ئەوا وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بکەوێتە خوارەوە ئینجا باڵندە بەخێرایی بیرفێنێت و پـەل پەلـی بکات یان بایەك فڕێی بداتە ناو شوێنێکی دوورەوە).

ئینجا ڕۆحەکەی دەگەڕێننەوە بۆ ناو لاشەکەی، فەرمووی: بەڕاستی گوێی لە دەنگی تەپەی پێلاوی شوێنکەوتووانی جەنازەکەی دەبێت لە کاتێکدا کە پشتی لێدەکەن و بەجێی دێڵن و دەگەڕێنەوە.

ئینجا دوو فریشتەی (تووند ڕاچڵەکێنەر) دێن بۆ لای و ڕایدەچڵەکێنن و دایدەنیشێنن.

فَيَقُولاَنَ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: کێ پەروەردگارتە ؟

فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِي.

ئەویش دەڵێت: چی چی نازانم.

فَيَقُولاَنَ لَهُ: مَا دِينُكَ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: ئایینت چییە ؟

فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ لاَ أَدْرِي.

ئەویش دەڵێت: چی چی نازانم.

فَيَقُولاَنَ لَهُ : فَمَا تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ ؟

ئینجا پێی دەڵێن: چی دەڵێیت سەبارەت بەو پیاوەی کە لە نێوانتاندا نێردرابوو ؟

فَلاَ يَهْتَدِي لِاسْمِهِ .

ناوەکەی نادۆزێتەوە.

پێی دەڵێن: مەبەستمان (مُحَمَّد)ە ؟

ئەویش دەڵێت: چی چی نازانم، دەمبیست خەڵك دەیگوت (مُحَمَّد) پێغەمبەری الله یە.

فەرمووی: پێی دەگوترێت: ئایا نەتزانی و نەشتخوێندەوە ؟

ئینجا بانگکارێك بانگ دەکات لە ئاسمانەوە: درۆی کرد ، ڕایخەن بۆی لە فەرشی ئاگر، بیپۆشن بە پۆشاکی ئاگر، دەرگایەکی بۆ بکەنەوە

بەرەو ئاگری دۆزەخ، جا لە گەرمی و هەڵم و بۆقاوی ئاگری دۆزەخی بۆ دێت.

جا گۆڕەکەی لـێ تەنگ دەکرێتەوە تاوەکو پەراسووەکانی دەچن بەیەکدا و تێکدەشکێن.

فەرمووی: پیاوێکی ڕوومەت ناشیرین و پۆشاك ناشیرینی بۆن گەنیوی بۆ دەنوێنرێت، و پێی دەڵێت: موژدەت لێبێت بەوەی کە پێت ناخۆشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێی دەدرا.

ئەویش پێی دەڵێت: تۆش الله مژدەی خراپت بداتێ، تۆ کێیت ؟ ڕوومەتت ڕوومەتێکە خراپە دێنێت.

ئەویش دەڵێت: من کردەوە پیسەکانتم، سوێند بە الله بە تۆم نەزانیوە ئیللا ئەوە نەبێت کە خاو و سست بوویتە و کەمتەرخەمیت کردووە لە گوێڕایەڵی الله دا و پەلە و دەست پێشخەریشت کردووە لە سەرپێچی الله دا، الله پاداشتی خراپت بداتەوە.

ئینجا فریشتەیەکی کوێر و کەڕ و لاڵی بۆ ڕادەسپێردرێت کە گورزێکی بە دەستەوەیە ئەگەر پێی بدرێت لە شاخێك دەیکات بە خۆڵ جا یەك گورزی لـێ دەدات تاوەکو دەیکات بە خۆڵ ئینجا الله تعالی دەیگێڕێتەوە بۆ دۆخەکەی جارانی ئینجا دووبارە گورزێکی تری لـێ دەدات جا هاوارێك دەکات هەموو شتێك دەیبیسێت تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێت.

ئینجا دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لە دۆزەخەوە و بۆی ڕادەخرێت لە فەرشی ئاگر.

جا ئەگەر ئەوەی بینی دەڵێت: پەروەردگارم با ڕۆژی قیامەت نەیەت.

(رواه الإمام أحمد : (٧/ ٥٣-٥٧) وأبو داود رقم : (٤٧٢٧)

**" بەهەمان شێوە ئەم حەدیسە بەڵگەشە بۆ سزای ناو گۆڕ "**

## * والكرام الكاتبون حق *

هەروەها ئەو دوو فریشتەیەی چاکە و خراپە دەنووسن ڕاست و حەقن.

هەروەکو الله تبارك وتعالی دەفەرمووێت: (مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ) (ق: ١٨)

واتە: هەر وتەیەکی لە دەم دەردەچێت، فریشتەی چاودێری ئامادە، لەلایەتی دەینووسێ.

ئایا فریشتەکان هەموو قسەیەك دەنووسن ؟ یان تەنها ئەو قسەیە دەنووسن کە پاداشت و تۆڵەی هەیە ؟ بەڵێ بەپێی ئایەتی: (ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد) هەموو ووتە و قسەیەك دەنووسن.

(ابن عەباس) دەڵێ: لە سەرەتاوە هەموو خێر و شەڕێکی ئادەمیزاد - تەنانەتی وشەی خواردم، ڕۆیشتم - دەنووسرێ، بۆ پاشان ڕۆژی پێنج شەممە، هەموو ووتە و کردەوەیەکی دەنوێنرێ و (عەرز) دەکرێ، ئەوجا هەر شتێ چاك و خراپ بێت بۆی دەنوسرێ و، ئەوی دیکەی دەسڕێتەوە، ئەوەیە کە الله تعالی دەفەرمووێت: (يمحو الله ما يشاء ويثبت وعنده أم الكتاب) (الرعد: ٣٩).

هەروەها الله سبحانە وتعالی دەفەرمووێت: {وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ (١٠) كِرَامًا كَاتِبِينَ (١١)} (الإنفطار)

واتە: لە کاتێکدا - کە ئێوە ئەوەندەش لاسار و یاخیین - دەستەیەك لە فریشتەی چاودێر و پارێزەرتان لەسەر دانراوە، هەرچی بکەن دەینووسن. ڕێزدارانێکی نووسەرن.

هەروەها الله عزوجل دەفەرموویت: (لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ) (الرعد: ١١)

واتە: ئەو خوایە (الله) کۆمەڵێك فریشتەی هەیە کە یەك لە دوای یەك دێن، لە پێشیەوە و لە پشتیەوە ئامادەن و پارێزگاری دەکەن بە فەرمانی الله.

(موجاهید) دەڵێ: هەموو کەسێك فریشتەیەکی بۆ دیاریکراوە بۆ پاراستنی بە فەرمانی الله لەهەر شتێك کە بیەوێ ئازار و ئەزیەتی پێبگەیەنێ، چ خەوتبێ، چ بەخەبەر بێ، لەمەیشدا جنی و ئادەمی یەکسانە.

(بوخاریی) و (موسلیم)یش ئەم فەرمودەیان لەم بارەیەوە هێناوە کە دەفەرمووێ: ((يتعاقبون فيكم ملائكة بالليل وملائكة بالنهار، فيجتمعون في صلاة الفجر و في صلاة العصر)) متفق عليه،

مەبەست ئەوەیە کە فریشتە بە شەو و بە ڕۆژ یەك بەدوای یەکدا بەردەوام دا دەبەزن بۆ پاراستنی مرۆڤ و، بۆ نووسینی کارو کردەوەی و، بۆ ئەوەیش لەکاتی نوێژی بەیانی و، عەسراندا کۆدەبنەوە و بەیەك دەگەن و، بەردەوام هەر لە چاودێریدان.

## * والبعث من بعد الموت حق *

هەروەها زیندوو بوونەوە لەپاش مردن، ڕاست و حەقە.

الله جل جلاله دەفەرمووێت: {وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ (٧٨) قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ (٧٩)} (يس)

واتە: مەسەل و نموونەیەکی بۆ هێنایەنەوە و، ئینکاری دەسەڵاتی ئێمەی کرد بۆ زیندوو کردنەوەی ئادەمیزاد و جن، هەروەها دروستبوونی خۆی لەبیر کرد !

چەند ئێسکێکی ڕزیوی هێناو ڕووی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد و گوتی: کێ دەتوانێ ئەو ئێسك و پروسکە ڕزیوانە زیندوو بکاتەوە ؟!. بۆ هۆی دابەزینی فرمایشتی (أولم يرى الإنسان)، (موجاهید و عیکرەمە) دەڵێن: (ئوبەی کوڕی خەڵەف) ئێسکە ڕزیوێکی بەدەستەوە گرت و ورد و خاشاکی کرد و دای بەدەم باوە، ئەوسا بە پێغەمبەری (صلى الله عليه و سلم) گوت: تۆ پێت وایە کە الله بتوانێ ئەمە زیندوو بکاتەوە ! ئەویش فەرمووی: ((نعم، يميتك الله تعالى، ثم يبعثك، ثم يحشرك إلى النار)). بەڵێ .. الله دەتمرێنێت، لەپاشان زیندووت دەکاتەوە، ئەوجا دەتنێرێ بۆ ئاگری دۆزەخ. رواه الطبري في تفسيره (٥٥٣/٢٠-٥٥٤)، وانظر: تفسير ابن كثير (٥٨٨/٣).

ئەی موحەممەد (صلى الله عليه و سلم) تۆ بڵێ: هەر ئەو کەسە کە یەکەمجار دروستیکردوون زیندووشتان دەکاتەوە چونکە ئەو خوایە بە هەموو دروستکراوێك زانا و بەئاگایە، دەزانێ چۆنی دروستکردوون و، چۆنیش زیندوویان بکاتەوە.

هەروەها الله تعالى دەفەرموویێت: (قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ) (الحجر: ٣٦)

واتە: ئیبلیس وتی ئەی پەروەردگاری من ! مەودام بدە تا ڕۆژی خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە، بۆ ئەوە تۆڵە لە ئادەم و نەوەکانی بکاتەوە.

هەروەها الله تبارك وتعالى دەفەرموویێت: (مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ) (لقمان: ٢٨)

واتە: خەڵکینە ! دروستکردن و زیندووکردنەوەی هەمووتان دوای مردن وەکو دروستکردن و زیندوو کردنەوەی تاکە کەسێکە، بەلای الله ئەوەندە ئاسانە، بەڕاستی الله زۆر بیسەر و ژنەوایە، زۆریش بینایە و ئاگادارە، هەموو شتێکیش بە وردی دەبینێ.

هەروەها الله عز وجل دەفەرموویێت: (زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ)(التغابن: ٧)

واتە: ئەوانەی کافرو بێ بڕوا بوون گوتیان: هەرگیز پاش مردن زیندوو ناکرێنەوە ! پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)، بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان لە گۆڕەکانتاندا دەردەهێنرێن و زیندوو دەکرێنەوە، پاشان لە هەر کارو کردەوەیەك ئەنجامتان داوە ئاگادار دەکرێن، لە گەورە و لە بچووك، و هەر بەوەش پاداشت دەدرێنەوە، ئەوەیش بۆ الله کارێکی ئاسانە، چونکە ئێوە خۆتان دەزانن کە لە سەرەتاوە شتێك نەبوون و وجوودتان نەبوو، پاشان دروستیکردن و بوون، باشە ئیتر چۆن ناتوانێ زیندووتان بکاتەوە ؟!

هەروەها الله سبحانە وتعالی دەفەرموویێت: (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ)(سبإ: ٣)

واتە: جا ئەوانەی خوانەناس و بێ بڕوابوون و نکووڵی زیندووبوونەوەیان دەکرد وتیان: هەرگیز ڕۆژی قیامەتمان بۆ نایە، واتە: بەهیچ شێوەیەك قیامەت نییە ! ، ئەی پێغەمبەر ! (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: بەڵێ سوێندم بە پەروەردگارم هەر بۆتان پێش دێت، لە لایەن خوای زانای گشت نادیار کە بە ئەندازەی تۆزقالێك شتی لێ ون نابێ، نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا، وە نە بچووکتر لە زەڕە و، نە گەورەتریش لێی، مەگەر ئەوە هەموو لەناو نامەیەکی ڕوونکەرەوە لە (لوح المحفوظ)دا لای اله عز وجل نووسراوە و هەڵگیراوە.

## * وأهل الكبائر في مشيئة الله عز وجل، لا نكفر أهل القبلة بذنوبهم، ونكل سرائرهم إلى الله عز وجل *

هەروەها أهلی تاوانە گەورەکان لەژێر ویستی الله ـدان، هەروەها أهلی قیبلە تەکفیر ناکەین بە تاوانەکانیان، هەروەها ئەوەی شاراوەیە لە ناخیاندا لێی دەگەڕێین بۆ الله عز وجل.

ئەهلی سوننە و جەماعە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی الله تعالی تەنیا لە شیرك و کوفری گەورە خۆشنابێت، و لە گوناهە گەورەکان خۆشدەبێت بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت.

هەروەکو الله تعالی دەفەرموویت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا) (النساء: ٤٨)

واتە: بە بێگومان هەرگیز الله لە دانانی هاوبەش بۆی نابورێ و لە خوار شیرکەوە لە هەر گوناهێك دەبورێ بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێت، جا هەر کەسێك هاوبەش بۆ الله دابنێ، بەڕاستی درۆ و گوناهێکی گەورەی کردووە.

هەروەها الله تعالی فەرمانمان پێ دەکات خۆمان بپارێزین لە گوناهە گەورەکان و لە گوناهە بچوکەکانیشمان چاوپۆشی دەکات.

قال الله تبارك وتعالى : (إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا) (النساء: ٣١)
واتە: ئەگەر ئێوە لەو تاوانە گەورانە خۆ دوور بگرن، ئێمەش لە هەڵە و پەڵەتان دەبورین و دەتانبەینە جێگایەکی بە قەدرو عیزەت و بەهەشتتان دەدەینێ.

هەڵبەتە دەبێ ئەوە بزانین خاوەن گوناهی گەورە گەر کوفر و شیرکی نەبێت بڕوادار حسابە و لە ڕۆژی دوایی لەژێر ویستی الله دایە کە ئایا بێ سزادان دەچێتە بەهەشتەوە یاخود دەچێتە دۆزەخ تاکو پاك دەبێتەوە ئینجا دەچێتە بەهەشتەوە.
بۆیە ناکرێ موسڵمانان لەسەر گوناهە گەورەکان بێ ئەوەی شیرك و کوفر ببینن برا یان خوشکەکەیان تەکفیر بکەن چونکە ئەمە یەکێکە لە سیفەتەکانی خەواریج و موعتەزیلە.
بۆ نموونە: ئەو موسڵمانەی کە قەتل دەکات گوناهێکی گەورەی کردووە، بەڵام الله تعالی ناوی بە بڕوادار هێناوە لە قورئاندا هەروەکو دەفەرموویت: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيءَ إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (الحجرات: ٩)

واتە: ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران پێکەوە بەجەنگ هاتن، جا هەرچی تواناتان هەیە بەکاری بێنن و ئاشتیان بکەنەوە و بانگیان بکەن بۆ لای بڕیارەکانی الله، جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژیی کردە سەر دەستەکەیتر، واتە: ملی ڕانەکێشا بۆ ئاشتی و یەککەوتن ئەوا ئێوەش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیاندا بجەنگێن کە دەستدرێژی دەکات تا ناچار دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ بڕیار و حوکمی الله، ئینجا ئەگەر کۆمەڵە ستەمکارەکە گەڕایەوە بۆ حوکمی الله، جا ئێوەیش بە ئینساف ناوبژییان بکەن و دادپەروەر بن و بەلای هیچ کەسێکیاندا دامەبڕن چونکە بێگومان الله دادپەروەرانی خۆش دەوێ.

ئیمامی بوخاری لە (ابو بکر)ەوە دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لەسەر مینبەر فەرمووی: ((ان ابنى هذا سيد، ولعل الله أن يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين)). ئەم کوڕەم - حەسەنی کچەزای - پیاوێکی بەڕێز و شەریفە، ئومێدەوارم لە ئایندەدا الله تعالى ئاگری دوو دەستە و تاقمی گەورەی موسڵمانانی پێ بکوژێنێتەوە. (بخاری: ٣٦١/٥)

هەروەها الله سبحانه وتعالی دەفەرمووێت: (ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ) (فاطر: ٣٢)

واتە: لەپاشان ئەم قورئانەمان کردە میرات و کەلەپوور بۆ ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردن، بەڵێ ... ئەم ئوممەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه و سلم) چاکترین گەلی هەڵبژێردراوە، هەر بۆیەش ئەم قورئانە دوای پەیامبەر (صلی الله علیه و سلم) دراوەتە دەستی ئەوان (فمنهم ظالم لنفسه) ئینجا ئەوانە سەبارەت بە قورئان دەبنە سێ بەشەوە: هەندێکیان - بە قسوور و کەمتەرخەمی کردنن لە کار پێکردنیدا - ستەم لە خۆ دەکەن. قسەی ڕاستیش ئەوەیە کە ئەوانە لەم ئوممەتەن (ومنهم مقتصد) بڕێکیشیان مامناوەندین، واتە: نە کەمتەرخەمی دەکەن و نە زیادەڕەویش (ومنهم سابق بالخيرات بإذن الله) هەندێکیشیان - بە فەرمانی الله - لە ئەنجامدانی کارە چاکەکاندا پێشکەوتوون. (تەبەڕانی) دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) دەفەرمووێت: ((كلهم من هذه الأمة)) واتە: ئەو سێ دەستە هەر هەموویان لەم ئوممەتەن. (ذلك هو الفضل الكبير) ئا ئەو میرات و کەلەپوورەیە فەزڵ و بەهرە گەورەکە، یان ئەو فەزڵە گەورەیە.

هەروەها الله عز وجل دەفەرمووێت: (وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا) (الطلاق: ٥)

واته: جا هەرکەسێك لە الله بترسێ و کار بە تاعەتی الله بکا، الله ش لە گوناهەکانی پاکی دەکاتەوە و چاوپۆشی لێ دەکات، وە پاداشتێکی زۆر گەورەی پێدەبەخشێت.

هەروەها ئەهلی سوننە ئەهلی قیبلەیان تەکفیر نەکردووە.

واتە گەر شەعائیری ئیسلامىمان بینی لە کەسێك و هیچ کوفر و شیرکمان لێی نەبینی بوو حوکمی ئیسلامی بەسەردا دەدەین و ناخیشی بۆ الله تعالی جێ دەهێڵین.

هەروەکو رسول الله (صلی الله علیه وسلم) منافقەکانی سەردەمی خۆی دەناسی و بەڵام حوکمی بە زاهیر دان و وەکو موسڵمانێك حسابی لەگەڵ دەکردن و تەکفیری نەکردن، بۆیە ئێمەش تاکو کوفر و شیرك نەبینین لەو کەسەی کە شەعائیری ئیسلام دەردەخات تەکفیری ناکەین و ناخی بۆ الله تعالی جێ دەهێڵین و الله تعالی ئاگادارە بە شتە زاهیر و پەنهانەکان.

هەروەکو الله تعالی دەفەرموویێت: (وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ) (النحل: ١٩)

واتە: هەرشتێ ئێوە بیشارنەوە و، بە پەنامەکی و بە نهێنی بیکەن و، هەرشتێکیش دەربخەن و بەئاشکرا ئەنجامی بدەن، الله هەر دەیزانێ.

بۆیە ئێمەش تەنیا بۆمان هەیە حوکم بە زاهیر بدەین و دڵی کەسمان شەق نەکردووە تاکو بزانین موسڵمانە یان کافر.

تەنیا لە کاتێکدا بۆمان هەیە کەسێك تەکفیر بکەین کە بە زاهیر کوفر و شیرکمان لەو کەسە بینی، چونکە ئەگەر کەسێك کوفر و شیرکی گەورە ئەنجام بدات ئەوا نوێژ کردن و تاعەت و عیبادەتی هەمووی بەتاڵە و ئەم شتانە نابن بە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی حوکمی کافری بەسەردا بدرێت. بەڵام کەسێك هیچ کوفر و شیرکت لێی نەدیبێت ناتوانی بڵێی کافرە ، هەروەکو ئەو پیاوەی کە گوتی لا اله الا الله بەڵام سەحابەکە هەر کوشتی، جا رسول الله فەرمووی ئایا کوشتت لەدوای ئەوەی گوتی لا اله الا الله ؟ گوتی یا رسول الله لە ترسی شمشێرەکەم وای گوت، رسول الله فەرمووی ئایا دڵیت شەق کردبوو ؟

عن أسامة بن زيد قال: بعثنا رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى الحُرَقة من جهينة، فصبحنا القوم، فهزمناهم، ولحقت أنا ورجلٌ من الأنصار رجلًا منهم، فلما غشيناه قال: لا إله إلا الله، فكف عنه الأنصاري، وطعنته برمحي حتى قتلته، قال: فلما قدمنا، بلغ ذلك النبي صلى الله عليه وسلم، فقال لي: ((يا أسامة، أقتلته بعد ما قال: لا إله إلا الله؟!)) قال: قلت: يا رسول الله، إنما كان متعوذًا، قال: فقال: ((أقتلته بعد ما قال لا إله إلا الله؟!)) قال: فما زال يكررها علي حتى تمنيت أني لم أكن أسلمت قبل ذلك اليوم. وفي

رواية لمسلم: قلت: يا رسول الله، إنما قالها خوفًا من السلاح، قال: ((أفلا شققتَ عن قلبه حتى تعلم: أقالها أم لا)).

لەم حەدیسە و چەندین حەدیسی تر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە تەنیا حوکم بە زاهیر دەدرێت تاکو کوفر و شیرکی لێ نەبینیت ناتوانی حوکمی کافری بەسەردا بدەیت.
بۆیە بینیمان هەر کەسێك شەهادەی هێناوە و نوێژ دەکات و هیچ کوفر و شیرکمان لێی نەدیوە ئەوا حسابی موسڵمانی بۆ دەکەین. بەڵام بە ئەنجامدانی کوفر و شیرك، شەهادە و نوێژ نابنە ڕێگر لەبەردەم کافربوونی کەسی ئەنجامدەر بە کوفر و شیرك.
بۆ ئەوەی لە بابەتەکەمان دوور نەکەوینەوە داواکارین لە هەموو کەسێك کە خۆی بە موسڵمان دەزانێت زیاتر گرنگی بە جۆرەکانی کوفر و شیرك بدات و هەوڵدات فێریان ببێت، چونکە بەڕاستی لەم سەردەمەی ئەمڕۆمان خەڵکێکی زۆر توشی ریددە و کوفر و شیرك بوونە و ناشزانن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی پشتیان لە دینەکەیان کردووە و هەوڵی فێربوون نادەن، جا نەزانی و جەهل نابێتە عوزر بۆ کەسانێك کە کوفر و شیرکی گەورە ئەنجام دەدەن لەکاتێکدا قورئان و حەدیسیان لەبەردەستە و دەتوانن فێری ببن بەڵام لەبەر دونیا پشتیان تێی کردووە.

## * ونقيم فرض الجهاد والحج مع أئمة المسلمين في كل دهر وزمان *

هەروەها بەرپا کردنی فەرزی جیهاد و حەج کردن ئەنجام دەدەین لەگەڵ پێشەوای موسوڵمانان لە هەموو کات و زەمانێکدا.

جیهاد لە ڕووی زمانەوانییەوە (لغة) چاوگەکەی (جاهد جهاداً ومجاهدة)، واتە: شەڕ کردن لەگەڵ دوژمن و تێکۆشان لەپێناو الله، واتای تێکۆشان: هیلاکی و وزەیە.

لە ڕووی شەرعەوە: بریتییە لە تێکۆشان و بەتاڵ کردنی توانا لە شەڕ کردن لەگەڵ خەڵکی کوفر و عیناد ، بۆ ئەوەی وشەی (لا إله إلا الله) سەرکەوێ و بڵند بێ ، هەروەها وشەی کوفر ژێرکەوێ.

قال تعالى: (وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ) (البقرة: ١٩٣)

[وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ] جا کوشتاری کافران بکەن تا فیتنە دروست نەبێت، دیسان فیتنە واتە: شیرك بڵاو نەبێتەوە واتە: ڕێگری لە دینی الله تعالى نەکەن [وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ] وە بۆ ئەوەی کە دینی الله تعالى بەرزو بڵند و بڵاو بێتەوە و خەڵك بێتە ناو ئیسلامەوە.

قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) ((مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ)) متفق عليه.

واته: هەركەسێ لەپێناو بڵندكردنی وشەی الله جەنگا ئەوە لەپێناو الله تعالی یە.

**قال شيخ الاسلام ابن تيميه:** جیهاد لەڕاستیدا تێکۆشانە لەپێناو بەدەستهێنانی ئەوەی وا الله پێی خۆشە ، لە ئیمان و کردەوەی چاکە ، هەروەها نەهێشتنی ئەوەی الله پێی ناخۆشە لە کوفر و فسق و سەرپێچی کردن. الفتاوى الكبرى (٥/١٨٧)

هەروەها ابن همام لەبارەی جیهادەوە دەڵێ: نەهێشتنی فەسادە لەم جیهانەدا. فتح القدير لإبن همام (٥/٤٣٤)

## ئامانج لە جیهاد کردن چییە لە ئیسلامدا ؟

١- بەرپاکردنی دین و بەدەستهێنانی پەرستن بۆ الله عزوجل.

٢- لەناوبردنی شیرك كە گەورەترین فەسادە لەسەر ڕووی زەوی ، قال تعالی: (وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ)

٣- ڕێنمایی کردنی خەڵکی و لابردنی کۆسپ و تەگەرەکان لەسەر ڕێگای بانگەوازی بۆ دینەکەی الله تعالی.

٤- پارێزگاری لە پێنج شتە زەروریيەکە ئەویش (دین ـ نەفس ـ ناموس ـ عەقل ـ ماڵ و سامانە).

٥- ڕێگایەکە بۆ جێگیرکردن لە زەوی و چەسپاندنی دینی الله تعالی و نەهێشتنی فەسادی دونیایی و ئایینیش.

٦- جێبەجێ کردنی بیروباوەڕی الولاء و البراء بە کردەوە، خۆشویستن و سەرخستنی ئەهلی تەوحیدە و ڕق لێبوون و دژایەتی ئەهلی کوفرە.

٧- نەهێشتنی زوڵم و ستەمە لەسەر زەوی، قال تعالی: (وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ)

٨- پاراستنی لایەن و عیزەتی موسڵمانانە و پاراستنی ماڵ و هێلانەیانە و سەرخستنی موستەزعەفەکانە ، قال تعالی: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَـٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴾

٩- دەرخستنی دوو ڕووەکان و جیاکردنەوەیان لە ئیمانداران ،

قال تعالی: ﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ

يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾

## قۆناغەکانی شەرعاندنی جیهاد:

لە سەردەمی مەککەدا پێغەمبەری الله (صلى الله عليەوسلم) ئەمری پێکرابوو بە لێخۆشبوون و لێبوردەیی و سەبرگرتن لەسەر ئازارەکان ، هەروەها موناقەشە کردن لەگەڵ موشریکەکان بە باشترین شێواز ، هەروەها ڕاسپێردرابوو بە جیهادکردنی کافرەکان بە ڕوونکردنەوەی بەڵگەکان و بەیان کردنی بۆیان ، ئەمری پێ نەکرابوو بە جیهادی شمشێر و شەڕکردن لەگەڵیان هەتاوەکو هیجرەتی کرد بۆ مەدینە. قال تعالى: ﴿وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴾

[وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ] جا ئارام بگرە لەسەر ئازاری کافران کە ئازارت دەدەن، و جوێنت پێ دەدەن، و قسەی ناشیرینت پێ دەڵێن [وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا] وە لێیان دوورکەوە دوورکەوتنەوەیەکی جوان، (هەجری جەمیل): ئەوەیە کە گلەیی و گازەندەی تیادا نەبێ.

﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾

[ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ] تۆ بانگەوازی خەڵکی بکە بۆ ڕێگای ڕاستی الله تعالى بە حیکمەتەوە، واتە: بە دانایی و کاربەجێیی، یاخود بە سوننەت بانگەوازیان بکە [وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ] هەروەها بە ئامۆژگاری جوان [وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ] جا ئەگەر کەسێك گومانی هەبوو مشتومڕو گفتوگۆی لەگەڵ بکە بە جوانترین شێواز تا تێی بگەیەنیت و وەڵامی گومانەکانی بدەیتەوە [إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ] بە دڵنیایی پەروەردگاری تۆ زاناترە بە کەسێك کە گومڕا بووە و لە ڕێگای ڕاست لایداوە [وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ] وە هەر الله تعالى زاناترە بەو کەسانەی کە هیدایەت دراون و لەسەر ڕێگای ڕاستن.

**شەرعییەتی جیهاد بەسێ قۆناغدا تێپەڕی:**

**قۆناغی یەکەم:** الله تعالى ئیزنی دا پێیان شەڕ بکەن لەپێناو الله ، ئیزنی دا نەوەك فەرز بێت.

قال تعالى: (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ)
(الحج: ٣٩)

الله تعالی ئیزن و ڕێگای دا بەو موسڵمانانەی کە لەلایەن کافرانەوە کوشتار دەکرێن لەبەرئەوەی زوڵم و ستەمیان لێکراوە کە ئەمانیش کوشتاری کافران بکەن، کە ئەمە یەکەم ئایەتە سەبارەت بە کوشتار کردنی کافران هاتۆتە خوارەوە، جا هاوەڵان زانیان کە کوشتار ڕوو دەدات [وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ] جا بە دڵنیایی الله تعالی لەسەر سەرخستنی باوەڕداران زۆر بە توانا و دەسەڵاتە کە سەریان بخات بەسەر کافراندا بەبێ کوشتاریش بەڵام تاقیان دەکاتەوە.

**قۆناغی دووەم:** لەم قۆناغەدا الله عز وجل ئەمری کرد بە کوشتاری ئەو کافرانەی کە کوشتاری موسڵمانان دەکەن ، وازبهێنن لەوانەی کوشتاریان ناکەن. دەتوانین ناوی ئەم قۆناغە بنێین قۆناغی دیفاع کردن، قال تعالی: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ (البقرة: ١٩٠)

[وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا] جا لە پێناو الله کوشتاری ئەو کەسانە بکەن کە کوشتارتان دەکەن بەڵام دەستدرێژی مەکەن.

**قۆناغی سێیەم:** لەم قۆناغەدا الله عز وجل ئەمری کرد بە کوشتاری هەموو کافران لە هەر جێگایەك بن هەتاوەکو موسڵمان دەبن یان ئەهلی کتاب جزیە بدەن بە سەرشۆڕی ملکەچی حوکمی ئیسلام بن.

قال تعالی: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (التوبة: ٥)

واتە: ئەگەر چوار مانگە حەرامەکە تەواو بوو (ذو القعدة و ذو الحجة و محرم و رجب) کە الله تعالی مۆڵەتی بە کافران دا ئەوا لە هەر شوێنێك موشریکانتان بینی بیانکوژن، لەبەر ئەوەی بەڵێن و پەیمان لە نێوانتاندا نەماوە [وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ] جا بە دیلی بیانگرن وە گەمارۆیان بدەن و قەدەغەیان بکەن لەوەی کە هەڵسوکەوت بکەن لە شارەکاندا [وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ] هەروەها لە هەموو ڕێگایەکدا بۆیان دانیشن و لە کەمیندابن بۆیان [فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ] بەڵام ئەگەر هاتوو تەوبەیان کرد و لە کوفر و گەڕانەوە و نوێژەکانیان کرد و زەکاتیماڵیاندا واتە: موسڵمان بوون ئەو کاتە ئێوە ڕێگەیان بەردەن نە بەدیل بیانگرن نە کەمینیان بۆ دابنێن نە بیانکوژن [إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ] بەڕاستی الله تعالی زۆر لێخۆشبوو و بە

بەزەییە بۆ ئەو کەسانەی کە تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای الله تعالی.

## جۆرەکانی جیهاد لەپێناو (الله) لە ڕووی حوکمەوە دەبێ بە دوو بەشەوە:

**یەکەم: فەڕزی کیفایە**

**دووەم: فەڕزی عەین**

**فەڕزی کیفایە:** ئەمەش جیهادی (طلب) ـە ، ئەم جۆرە جیهادە کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئەنجامیاندا ئەوا لەسەر هەموو موسڵمانانی تر لادەکەوێ ، هەروەکو نوێژی جەنازە.

بەڵگەمان چییە کە لە ئەسڵدا فەرزە، قال تعالی: (كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ) (البقرة: ٢١٦)

واتە: الله تعالی کوشتاری کافرانی لەسەرتان فەرز کردووە هەرچەندە ئەم کوشتارە قورسە لەسەرتان.

هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليەوسلم) دەفەرموویێت: ((من مات ولم يغزُ ولم يحدث نفسه بالغزو مات على شعبة من النفاق)) (أخرجه مسلم: ١٩١٠)

واتە: هەر کەسێك بمرێ و هیچ غەزا (جیهاد) یەکی نەکردبێ و یان خۆی نەدواندبێت بۆ غەزا (واتە هیچ خۆ ئامادەکردنێکی تێدا نەبێت) ئەوا ئەگەر بمرێت لەسەر پۆلێك لە دووڕوویی دەمرێ.

هەروەها موسڵمانان کۆ دەنگن لەسەر واجبێتی ئەم جۆرە جیهادە.

هەروەها ئایا بەڵگەمان چییە بۆ ئەوەی واجب نییە لەسەر هەموو تاکێکی موسڵمانان ، قال تعالى: ﴿وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ (التوبة: ١٢٢)

واتە: [وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً] جا نابێ باوەڕداران هەر هەموویان بەیەکەوە دەرچن بۆ غەزا و مەدینە چۆڵ بکەن [فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ] لە هەر کۆمەڵێك لەوانە کەسانێك بمێنێتەوە لەناو شاردا [لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ] بۆ ئەوەی کە لە دین شارەزا بن و بەدوای زانستی شەرعیدا بگەڕێن [وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ] ئینجا پاشان کە لە دین فێربوون و گەڕانەوە قەومەکەیان ئاگادار بکەنەوە [لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ] بەڵکو ئەوانیش خۆیان بپارێزن، یاخود ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری الله دا (صلى الله عليه وسلم) دەڕۆن

ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فێری دین و قورئان و ئەحکامی جیهاد و ئەو شتانە دەبن ، جا دواتر کە گەڕانەوە خەڵکەکە فێر بکەن.

**فەڕزی عەین: جیهاد بە سێ جۆر دەبێتە فەرزی عەین:**

**یەکەم:** ئەگەر موسڵمانێك هاتە ڕیزی جەنگ واتە ڕووبەڕوو بوویەوە.
قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ۞ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ (الأنفال: ١٥-١٦)
واتە: [يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا] ئەی باوەڕداران ئەگەر ڕووبەڕووی کافران بوونەوە و لێیان نزیك بوونەوە [فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ] ئەوە ئێوە پشتیان لێ هەڵمەکەن وە تێك مەشکێن و ڕامەکەن.
[وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ] لە ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەی کافراندا هەر موسڵمانێك پشتیان تێ بکات و ڕابکات ئەوە تاوانی گەورەیە [إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ] تەنها مەگەر کەسێك لەلایەکەوە بچێتە لایەکی تر خۆی ئامادە بکاتەوە وەکو فێڵ کردن لە دوژمن [أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ] یان لەم کۆمەڵە جیا دەبێتەوە دەچێتە ناو کۆمەڵێکی تر بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات و دیسان بداتەوە بەسەر دوژمناندا، ئەم ئایەتە لەسەر ئەو هاوەڵانە

دابەزی کە بەشداری غەزای بەدریان کرد، بەڵام حوکمەکەی گشتییە بۆ هەموو موسڵمانان و ڕاکردن لە کاتی غەزادا لە تاوانە گەورەکانە [فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ] لەم دوو حاڵەتە نەبێ هەر کەسێك بەرامبەر کافران پشت هەڵبکات و هەڵبێت و ڕابکات ئەوانە تووشی غەزەبی الله دەبن و الله تعالى لێیان تووڕە دەبێ [وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ] جا ئەو کەسانەی کە ڕایانکردووە شوێنیان ئاگری دۆزەخە کە خراپترین سەرەنجامە.

**دووەم:** ئەگەر دوژمن خاکێکی موسڵمانانی داگیر کرد ، ئەوا لەم کاتەدا جیهاد دەبێتە فەرزی عەین لەسەر هەموو موسڵمانان بۆ ئەوەی ئەو دوژمنە داگیرکەرە دەربکەن لە خاکی ئیسلام. هەروەکو ئەمڕۆ کە موسڵمانان هیچ خاکێکیان نییە و هەمووی لەژێر دەستی کافران و دوژمنانی ئیسلامە و لە هیچ وڵاتێکی بەناو ئیسلامی حوکم بە قورئان و ئیسلام ناکرێت و یاسا کوفرییەکانی مرۆڤیان هێناوەتە شوێن حوکم و یاساکانی الله و حوکمی قورئان بە دواکەوتوویی دەزانن و دەڵێن بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێ والعياذ بالله.

قال تعالى: (انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا)

واتە: ئێوە هەمووتان دەرچن بۆ جیهاد کردن لە پێناو الله بە چوست و چالاك و تەمبەڵەوە، بە دەوڵەمەند و هەژارەوە، بە گەنج و پیرەوە، بە

پیادە و سوارچاکەوە، بە منداڵدار و بێ منداڵەوە، بە خێزاندار و بێ خێزانەوە، بە سەرقاڵ و دەست بەتاڵەوە، هەر هەمووتان دەرچن کاتێك کە جیهاد و غەزا کردن فەرزی عەین بێت.

**سێیەم:** کاتێك ئیمام یاخود خەلیفەی ئیمانداران داوا دەکات و بانگەواز دەکات واتە **(نفیر العام)** ئەوا واجبە لەسەر هەموو موسڵمانان وەڵامی بانگەوازەکەی بدەنەوە.

قال تعالى: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الْأَرْضِ) (التوبة: ٣٨)

واتە: ئەی باوەڕداران ئایا ئێوە چیتانە کاتێك کە پێتان دەوترێ دەرچن بۆ جیهاد کردن لە پێناو الله ئێوە وەك ئەوەی زەویەکە بتانگرێتە خۆیەوە و دوا دەکەون و تەمبەڵی دەکەن و کەمتەرخەمی دەکەن.

**تێبینی:** کاتێك جیهاد بوو بە فەرزی عەین هیچ مەرجێکی نامێنێت لە مەرجەکان وەکو (پرس کردن بە امام یان دایك و باوك ، یان ئیزن وەرگرتنی قەرزدار لە خاوەن قەرزەکەی ، هەر کەسێك توانای هەڵگرتنی چەکی هەبێت ئەوا دەبێ چەك هەڵبگرێ و بجەنگێ).

## مەرجەکانی جیهادکردن لەپێناو الله تعالى:

**جیهاد شەش مەرجی هەیە:**

١- ئیسلام (موسڵمان بێت)، چونکە کافر هیچ کردەوەیەکی لێ وەرناگیرێ.

٢- بالغ بوون، کەواتە لەسەر منداڵ واجب نییە. بەڵگەمان ئەوەیە (ابن عمر رضي الله عنهما) دەڵێ لە ڕۆژی ئوحود خۆمم بە پێغەمبەر (صلى الله علیەوسلم) پیشاندا لەو کاتەدا تەمەنم چواردە ساڵ بوو ڕێی پێم نەدا بجەنگم.

٣- عاقڵ، لێرەدا لەسەر کەسێك کە مێشکی لەدەست دابێت واجب نییە. یەکێك لەوانەی قەڵەمیان لەسەر نییە (وعن المجنون حتى یعقل).

٤- ئازادی، واتە نابێ کۆیلە بێت (العبد)، بەڵام لە کاتی دەرکردنی دوژمنی داگیرکەر لەسەر کۆیلەش واجبە.

٥- نێر، واتە لەسەر ئافرەتان واجب نییە جیهادی ئەوان (حەج کردنە شەڕی تێدا نییە.

٦- توانای لاشەیی و ماددی، بۆیە کەسێك لە توانای نەبێت جیهادی لەسەر نییە . ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا

يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾

## چەند فەرموودەیەك دەربارەی جیهاد:

عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي وَهُوَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ (صلى الله عليه وسلم): (إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ) فَقَامَ رَجُلٌ رَثُّ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى آنْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ هَذَا ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَرَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَقْرَأُ عَلَيْكُمُ السَّلَامَ، ثُمَّ كَسَرَ جَفْنَ سَيْفِهِ فَأَلْقَاهُ، ثُمَّ مَشَى بِسَيْفِهِ إِلَى الْعَدُوِّ فَضَرَبَ بِهِ حَتَّى قُتِلَ. [صحيح مسلم]

واتە: لە أبو بكر ی كوڕی عبدالله ی كوڕی قيس ئەویش لە باوكیەوە دەڵێ: گوێم لە باوكم بوو لە كاتێكدا ئامادەی جەنگ بوو ڕوو بە دوژمن دەیوت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لەڕاستیدا دەرگاكانی بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەكاندان) پیاوێكی شڕۆڵ وتی: ئەی أبو موسى تۆ خۆت گوێت لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە كە وا بفەرموویێت ؟ وتی: بەڵێ، دەڵێ: ئیتر گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەكانی وتی: سەلامتان لێدەكەم (خوا حافیزی كرد) و پاشان كێلانی شمشێرەكەی شكاند و فڕێی داو بەرەو دوژمن ڕۆیشت هەر بەردەوام بە شمشێرەكەی لە دوژمنی دەدا هەتا كوژرا.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم): (تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَإِيمَانًا بِي وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِي، فَهُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلًا مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهِ حِينَ كُلِمَ، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْلَا أَنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلَافَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا، وَلَكِنْ لَا أَجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ، وَلَا يَجِدُونَ سَعَةً، وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوَدِدْتُ أَنِّي أَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ). [رواهُ مُسلمٌ وروى البخاريُّ بعْضهُ]

واته: أبو هريرة (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (الله تعالى دەستەبەری ئەو کەسەی کردووە کە لە پێناوی ئەودا دەربچێت و فەرموویەتی: هەرکەس دەرچوونەکەی تەنها لە ڕێگەی مندا و باوەڕ بە من و بەڕاست زانینی پێغەمبەرەکانمدا بێت ئەوە من زامنی ئەوەی بۆ دەکەم بیخەمە بەهەشت، یان بیگێڕمەوە بۆ ئە و ماڵەی لێی دەرچووە لەگەڵ ئەوەی بە دەستی هێناوە لە پاداشت و دەستکەوتی جەنگ، سوێند بەو کەسەی گیانمی بە دەستە هیچ برینێك نییە کە لە ڕێگەی الله دا کرابێت مەگەر کاتێك (خاوەنەکەی) لە ڕۆژی قیامەت دێت و زیندوو دەبێتەوە وەکو خۆی چۆن بریندار بووە لەو کاتەدا بریندار بووە ڕەنگی برینەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەیشی

بۆنی میسکە. سوێند بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ ببێتە زەحمەت لەسەر موسڵمانان لەپاش هیچ لەشکرێکەوە کە دەرچێت و بجەنگێت لە ڕێگەی الله دا هەرگیز دانەدەنیشتم و نەدەمامەوە، بەڵام من ئەمەندەم لە دەستدا نییە بتوانم هەڵیان گرم و ئەوانیش ئەمەندەیان لەدەستدا نییە. لایشیان ناڕەحەتە لەمن دوا بکەون، سوێند بەوەی گیانی محمدی بە دەستە من حەز دەکەم لە ڕێگەی الله دا بجەنگم و بکوژرێم، هەم دیسان بجەنگم و بکوژرێم دیسان بجەنگم و بکوژرێمەوە).

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) نَّ رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (يَا أَبَا سَعِيدٍ، مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ). فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ: أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَفَعَلَ، ثُمَّ قَالَ: (وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ). قَالَ: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ: (الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ). [صحيح مسلم]

واتە: أبو سعيد ی الخدری (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەی أبو سعيد هەر کەس ڕازی بێت بەوەی الله پەروەردگاری بێت و محمدیش پێغەمبەری بێت، بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، (أبو سعيد)یش سەری سوڕما وتی: بۆم دووبارە

بکەرەوە ئەی پێغەمبەری الله، ئەویش بۆی دووبارە کردەوە، پاشان فەرمووی: (شتێکی دیکەیش کە بەندە تیایدا سەد پلە لە بەهەشتا پێی بەرز و بڵند دەبێتەوە، هەر نێوان دوو پلەش بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوییە). وتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری الله ؟. فەرمووی: (جیهاد کردنە لە ڕێگەی الله دا، جیهاد کردنە لە ڕێگەی الله دا).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (صلى الله عليه وسلم): (مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نفاق). [صحيح مسلم]

واتە: أبو هريرة (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەس بمرێت و جەنگی لە ڕێگەی الله دا نەکردبێت و بە دڵیشیدا نەهاتبێت کە بیکات، ئەوە لەسەر بەشێك لە دووڕوویی مردووە.

عَنْ سَلْمَانَ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: (رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ. وَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ، وَأَمِنَ الْفَتَّانَ). [صحيح مسلم]

واتە: سلمان (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بیست کە دەیفەرموو: (سەنگەرگیری شەو و ڕۆژێك (لە ڕێگەی الله دا) چاکترە لە ڕۆژووی سونەتی مانگێك و شەونوێژی شەوەکانی،

ئەگەر لەو ماوەیەشدا بمرێت کردەوە چاکەکانی دونیای هەر بە بەردەوامی بۆ دەمێنێتەوە و ڕزق و ڕۆزیەکەی بەردەوام دەبێت و لە سزای گۆڕیش دڵنیا دەبێت.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم): (لَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا). [صحيح البخاري]

واتە: أنس (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سوێند بە الله سەر لە بەیانی دەرچوونێك لە ڕێگەی الله دا یان سەر لە ئێوارە دەرچوونێك چاکترە لە دونیا و هەرچی لە دونیادا هەیە).

عن النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ إِلَّا أَنْ أُسْقِيَ الْحَاجَّ، وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ إِلَّا أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَقَالَ آخَرُ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ، فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ (رضي الله عنه) وَقَالَ: لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: [أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ

الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ...  الْآيَةَ إِلَى آخِرِهَا]. [صحيح مسلم]

واته: نعمان ی کوڕی بشیر (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: من لای دوانگەکەی پێغەمبەری الله بووم (صلی الله علیه وسلم) پیاوێك وتی: گوێم لێ نییە ئەگەر پاش ئیسلامەتی هیچ کردەوەیەکی چاکەم هەبێت جگە لە ئاودان بە حاجیان. پیاوێکی دیکەیش وتی: گوێم لێ نییە ئەگەر هیچ کردەوەیەکی چاکەم هەبێت پاش ئیسلامەتی جگە لە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی (حەرام) پیاوێکی دیکە وتی: خەبات کردن لە ڕێگەی الله دا باشترە لەوەی کە وتتان، (عمر)یش (الله لێی ڕازی بێت) لێیان تورە بوو وتی: لای دوانگەی پێغەمبەری الله دەنگتان بەرز مەکەنەوە. ئەو ڕۆژە ڕۆژی (جومعە) بوو کە نوێژی (جومعە)م کرد دەچمە خزمەتی و پرسیاری لێ دەکەم دەربارەی ئەوەی کە جیاواز بوون تیایدا. ئیتر الله تعالی ئەم ئایەتەی نارد کە ئەمە ماناکەیەتی: (ئایا ئاودان بە حاجیان و ئاوەدان کردنەوەی ماڵی الله (المسجد الحرام)تان وەك کەسێك داناوە کە باوەڕی بە الله و ڕۆژی دوایی هەبێت و ... ).

عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ (رضي الله عنه): عَمِّيَ الَّذِي سُمِّيتُ بِهِ، لَمْ يَشْهَدْ مَعَ رَسُولِ (صلى الله عليه وسلم) بَدْرًا، قَالَ: فَشَقَّ عَلَيْهِ، قَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ شَهِدَهُ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم) غُيِّبْتُ عَنْهُ،

وَإِنْ أَرَانِيَ اللَّهُ مَشْهَدًا فِيمَا بَعْدُ مَعَ رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم)، لَيَرَانِي اللَّهُ تعالى مَا أَصْنَعُ. قَالَ: فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا، قَالَ: فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ لَهُ أَنَسٌ: يَا أَبَا عَمْرٍو أَيْنَ ؟ فَقَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الْجَنَّةِ أَجِدُهُ دُونَ أُحُدٍ. قَالَ: فَقَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ، قَالَ: فَوُجِدَ فِي جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ، قَالَ فَقَالَتْ أُخْتُهُ عَمَّتِيَ الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ: فَمَا عَرَفْتُ أَخِي إِلَّا بِبَنَانِهِ. وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: [رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا] (الاحزاب: ٢٣) قَالَ: فَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَصْحَابِهِ. [بخارى/الجهاد/٢٦٥١]

واته: ثابت (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: أنس وتی: ئەو مامەیەم کە من بە ناویەوە ناونراوم ئامادەی جەنگی بەدر نەبوو لە خزمەت پێغەمبەری الله دا (صلى الله عليه وسلم) دەڵێ: ئەویش ئەمەی لا زۆر زەحمەت بوو. وتی: یەکەم جەنگێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئامادەی بوو منی لێ بێبەش بووم و ئامادەی نەبووم ئەگەر لەمەولا الله تعالى دیمەنی جەنگێکی دیکەی نیشان دام لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە الله دەزانێت چی دەکەم، دەڵێ: ترسا کە شتێکی تر بڵێ. لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لە جەنگی ئوحود دا ئامادە بوو. لەو ڕۆژەدا سعد ی کوڕی معاذ بەرەو ڕووی دێت و أنس پێی دەڵێت: ئەی أبا عمر بەرەو کوێ ؟ ئەویش دەڵێ: ئاە تامەزرۆی

بۆنی بەهەشتم لە ڕووی کێوی ئوحود دا هەستی پێدەکەم، ئیتر لەگەڵیان جەنگا تا کوژرا، لە لەشیدا هەشتا و ئەمەندە برینی تێدابوو لە لێدانی ڕم و شیر و تیر. خوشکەکەی کە (ربیع)ی کچی (النضر) دەڵێ: براکەمم نەناسیەوە بەسەرە پەنجەکانیدا نەبێت. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: (لە نێو بڕوادارانداا پیاوانێك هەن لەسەر بەڵێنی خۆیان مردوون بە ئاکامی خۆیان گەیشتن و هەشیانە چاوەڕوان دەکات و بەڵێنی خۆیانیان نەگۆڕیوە)، دەڵێ: خەڵکی وای بۆ دەچوون کە ئەم ئایەتە لە شانی ئەو و هاوەڵەکانیاندا هاتبێتە خوارەوە.

عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا). [بخارى/الجهاد/١٠٩٢]

واتە: زید ی کوڕی خالد الجهني (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر کەس تفاقی جەنگاوەرێك ساز بکات و بیخاتە سەر ڕێ ئەویش هەر غەزای کردووە، هەر کەسیش بە جوانی خزمەتی ماڵ و منداڵی جەنگاوەرێك بکات ئەویش هەر غەزای کردووە).

عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم): حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ

كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلًا مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ فَيَخُونُهُ فِيهِمْ، إِلَّا وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَأْخُذُ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ، فَمَا ظَنُّكُمْ). [صحيح مسلم]

واتە: لە سلیمان ی کوڕی بریدەوە ئەویش لە باوکیەوە دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ڕێز و حورمەت گرتن لە خێزانی جەنگاوەران لەسەر لێکەوتەکان [ئەوانەی لە غەزا دواکەوتوون بەهۆی عوزرێکەوە] وەك ڕێز و حورمەتی دایکیان وەهایە ، هەر پیاوێك لە لێکەوتەکان لەپاش هەر پیاوێك لە موجاهیدەکان بەجێ بمێنێ لەناو ماڵ و منداڵیدا و خیانەتیان لێ بکات لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەوەستێنرێت و چەندی بوێ لە چاکەکانی دەیبات بۆ خۆی ئیتر گومانتان چۆنە).

## * ولا نرى الخروج على الأئمة، ولا القتال في الفتنة، ونسمع ونطيع لمن ولآه الله أمرنا، ولا تنزع يدا من طاعة *

هەروەها وای نابینین دەربچین لەسەر پێشەوای موسوڵمان، وە شەڕیش ناکەین لەکاتی فیتنەدا، هەروەها گوێگر و گوێڕایەڵین بۆ کەسێك کە الله تعالی کردبێتی بە وەلی أمر بەسەرمانەوە، وە دەست بەرداری گوێڕایەڵی کردنی نابین.

الله سبحانه تعالی دەفەرموویێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ) (النساء: ٥٩)

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ! گوێڕایەڵی فەرمانی الله و پەیامبەر بن لە هەموو کاروبارێکدا، هەروەها بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن، واتە: بە قسەی ئەو کاربەدەست و زانایانە بکەن، کە لە خۆتانبن. واتە: لە چوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الْأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الْأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي). [البخاري /الأحكام /٦٧١٨]

واتە: أبو هريرة (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (هەرکەسێ گوێڕایەڵی من بکات ئەوا گوێڕایەڵی الله ی کردووە، هەر کەسێ سەرپێچی من بکات ئەوا سەرپێچی الله ی کردووە، هەر کەسێ گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکەی بکات ئەوا گوێڕایەڵی منی کردووە، هەر کەسێ سەرپێچی فەرمانڕەواکەی بکات ئەوا سەرپێچی منی کردووە).

عَنْ يَحْيَى بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ الْحُصَيْنِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَ: سَمِعْتُهَا تَقُولُ: حَجَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَجَّةَ الْوَدَاعِ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَوْلًا كَثِيرًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ مُجَدَّعٌ - حَسِبْتُهَا قَالَتْ - أَسْوَدُ، يَقُودُكُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا). [صحيح مسلم]

واتە: يحيى کوڕی حصين، لە دایە گەورەیەوە دایکی (حصين) (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لە دایە گەورەمەوە بیستم دەیووت: لە خزمەتی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) دا حەجی ماڵئاواییم کرد، پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) قسەی زۆری فەرموو، لە پاشاندا لێم بیست دەیفەرموو: (ئەگەر بەندەیەکی لووت و گوێ بڕاو وابزانم نەنکم وتی ڕەش پێستیش ـ کرایە فەرماندە بەسەرتانەوە بە قورئانەکەی الله پێشەوایەتی کرد ئەوا گوێڕایەڵ و ملکەچی بن).

## گوێڕایەڵی بۆ چاکە و سەرپێچی لە خراپە:

عَنْ عَلِيّ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا، فَأَوْقَدَ نَارًا وَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الْآخَرُونَ :إِنَّا قَدْ فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: (لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). وَقَالَ لِلْآخَرِينَ قَوْلًا حَسَنًا، وَقَالَ: (لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ). [البخاري / التمني / ٦٨٣٠]

واتە: علی (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) سوپایەکی نارد و پیاوێکی کردە فەرماندەیان، ئەمیش ئاگرێکی کردەوە و وتی: بچنە ناوی، کەسانێك ویستیان بچنە ناو ئاگرەکە، کەسانێکی تریش وتیان: ئێمە لە ئاگر ڕامانکردووە، ئەم ڕووداوە باس کرا بۆ پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی بەوانە کە ویستیان بچنە ناو ئاگرەکە: (ئەگەر بڕۆشتنایەتە ناوی هەتا ڕۆژی دوایی تیایدا دەبوون). هەروەها فەرموودەیەکی چاکیشی بەوانی تر فەرموو، ئینجا فەرمووی: (گوێڕایەڵی ناکرێ بۆ سەرپێچی الله، بەڵکو گوێڕایەڵی بۆ چاکەیە و بەس).

**ئەگەر فەرمان درا بە تاوان گوێڕایەڵی ناكرێت:**

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: (عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، إِلَّا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ). [البخاري / الأحكام /٦٧٢٥]

واتە: ابن عمر (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (پێویستە كەسی موسڵمان گوێڕایەڵ و ملكەچ بێت لەو شتەدا پێی خۆشە یان پێی ناخۆش بێ، مەگەر فەرمانی پێ بدرێ بە تاوان جا ئەگەر فەرمانی پێدرا بە تاوان ئەوا نە گوێڕایەڵ بێ و نە ملكەچ).

**گوێڕایەڵی كردنی فەرمانڕەواكان با مافەكانیش بگرنەوە:**

عَنْ وَائِلٍ الْحَضْرَمِيِّ قَالَ: سَأَلَ سَلَمَةُ بْنُ يَزِيدَ الْجُعْفِيُّ (رضي الله عنه) رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ قَامَتْ عَلَيْنَا أُمَرَاءُ يَسْأَلُونَا حَقَّهُمْ وَيَمْنَعُونَا حَقَّنَا، فَمَا تَأْمُرُنَا ؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ، فَجَذَبَهُ الْأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ وَقَالَ: اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ، وَفي رواية قَالَ: فَجَذَبَهُ الْأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ). [رواه وائل بن

حجر الحضرمي والد علقمة، نقله مسلم في صحيح مسلم وحكم عنه بأنه: صحيح]

واتە: وائل الحضرمي دەڵێ: سلمة كوڕی یزید الجعفي (الله لێی ڕازی بێت) پرسیاری كرد لە پێغەمبەری الله (صلى الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله علیه وسلم)، چۆنە ئەگەر جۆرە فەرمانڕەوایانێك بوونە بەرپرسمان داوای مافەكانی خۆیانمان لێبكەن و لە مافەكانی خۆیشمان بێبەشمان بكەن، ئەو كاتە فەرمانمان بە چی پێدەكەیت، ڕووی لێوەرچەرخان، دیسان پرسیاری لێكردەوە هەر ڕووی لێوەرچەرخان پاشان بۆ دووبارە یان سێبارە پرسیاری لێكردەوە، ئینجا أشعث ی كوڕی قیس بەتوندی ڕایكێشا و وتی: گوێڕایەڵ و ملكەچ بن، ئەوان بەرپرسن لەوەی لە ئەستۆیاندایە و ئێوەش بەرپرسن لەوەی لە ئەستۆتان دایە، لە ڕیوایەتێكی تردا، وتی أشعث ی كوڕی قیس ڕایكێشا، ئینجا پێغەمبەری الله (صلى الله علیه وسلم) فەرمووی: گوێڕایەڵ و ملكەچ بن، ئەوان بەرپرسن لەوەی لە ئەستۆیاندایە ئێوەش بەرپرسن لەوەی لە ئەستۆتاندایە.

**تێبینی:** مەبەست لە فەرمانڕەوایەكە كە حوكمی قورئانی قبوڵە و موسڵمانە، نەك وەك كەسانێك كە ئەمڕۆ بەناوی سەلەفی (كە دوورن لە ڕێگەی سەلەف) پەیابوونە و گوێڕایەڵی سەرۆكێكی كافر دەكەن لەكاتێكدا حوكم بە قورئان ناكرێت و حوكمی دیموكراسییان خستۆتە شوێن حوكمی قورئان و حوكمەكانی قورئان بە وەحشیگەرییەتی و

دواکەوتوویی دەزانن، وە دۆستایەتی کافران دەکەن و خۆشەویستیان بۆ کافران هەیە و سەریان دەخەن و ملکەچی فەرمانی کافرانن کەچی هەر بۆیان پەردەپۆش دەکەن و بە موسڵمانیان دەزانن.
جا ئەم جۆرە سەرۆکانە جیهاد کردن بەرامبەریان واجبە و دەبێت موسڵمانان جیهادیان بەرامبەر بکەن.

## فەرمانڕەوایی چاك و فارمانڕەوایی خراپ:

عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (خِيَارُ أَئِمَّتِكُمِ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ. وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمِ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ ؟ فَقَالَ: (لَا، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلَاةَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلَاتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ، وَلَا تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ). [الراوي: عوف بن مالك الأشجعي | المحدث: مسلم | المصدر: صحيح مسلم، الصفحة أو الرقم: ١٨٥٥ | خلاصة حكم المحدث : صحيح]
واتە: عوف ی کوڕی مالك (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (چاکترین فەرمانڕەواکانتان ئەوانەن کە خۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن، دوعای چاکەتان بۆ دەکەن و دوعای چاکەیان بۆ دەکەن، خراپترین فەرمانڕەواکانتان ئەوانەیانن کە ڕقتان لێیان دەبێ و ڕقیان لێتان دەبێ، نەفرەتیان لێدەکەن و نەفرەتتان لێدەکەن). وترا: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم)، ئەی بە

شمشێرەکان نەجەنگێین لە گەڵیاندا ؟ فەرمووی: (نەخێر، مادام نوێژ لەناوتاندا دەکەن، هەر کاتێ شتێکتان بینی لە فەرمانڕەواکانتان کە پێتان ناخۆش بێ ئەوا دەست مەکێشنەوە لە گوێڕایەڵی).

**تێبینی:** مەبەستی لە فەرمانڕەوایەکە حوکمی قورئانی قبوڵە بەڵام توشی زوڵم و فسقێك بووە کە لە دین دەری ناکات. نەك مەبەستی سەرۆکێك بێت حوکمی قورئان پەك بخات و تەنیا بە قسە بڵێ موسڵمانم و زۆربەی قسە و کرداریشی پێچەوانەی ئیسلام بێت و پشتی کافرانی گرتبێت دەیان کوفر و شیرك لە یاساکانیان هەبێت. هەروەها ئەگەر کافران سوکایەتی بە ئیسلام بکەن پشتیان بگرێت، ئا ئەم جۆرە سەرۆکانە و شوێنکەوتووانیان لە کافرێك زیاتر هیچی تر نین.

**ناڕەزایی دەرنەبڕین لە کارە ناشەرعیەکانی فەرمانڕەواکان:**

عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: (إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ، فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نُقَاتِلُهُمْ ؟ قَالَ: (لَا، مَا صَلَّوْا). أَيْ مَنْ كَرِهَ بِقَلْبِهِ وَأَنْكَرَ بِقَلْبِهِ. [الراوي: أم سلمة أم المؤمنين

| المحدث: مسلم | المصدر: صحيح مسلم، الصفحة أو الرقم: 1854 | خلاصة حكم المحدث : [صحيح]

واتە: أم سلمة (الله لێی ڕازی بێت) هاوسەری پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (کەسانێك دەکرێتە فەرمانڕەواتان، کاری وایان لێدەبینی کە هەندێکیان پەسەندی شەرعن و هەندێکیان پەسەندی شەرع نین، هەر کەسێ پێی ناخۆش بێ (واتە ناشەرعیەکان) ئەوا بێتاوانە، وە هەرکەسێکیش نکوڵی لێبکا ئەوا سەلامەتە لە تاوان، بەڵام (تاوان بار) کەسێکە کە ڕازی بێت (بەو ناشەرعیانە) و شوێنکەوتە بێت). وتیان ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم): ئەی نەجەنگێین لەگەڵیاندا ؟ فەرمووی: (نەخێر، تا نوێژ بکەن).

**تێبینی:** مەبەستی فەرمانڕەوایەکی موسڵمانە و هیچ کوفر و شیرکی نییە و لە بنچینەکانی دین کێشەی نییە و حوکمی قورئانیشی قبوڵە و باوەڕی تەواوی بە حوکمەکانی قورئان هەیە بۆیە جیهادی بەرامبەر ناکرێت، بەڵام هەموو سەرکردەکانی ئەمڕۆی وڵاتە بەناو ئیسلامییەکان جیهاد کردن بەرامبەریان واجبە چونکە ئەوانە تاغوتن و ڕازین بە یاسا دەستکردە کوفرییەکان و یاسا دەستکردەکانیان خستۆتە شوێنی قورئان و حوکم بەم یاسا کوفرییانە دەکەن، جا ئەمانە و شوێنکەوتووانیان کافرن نەك موسڵمان.

**دەست گرتن بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە کاتی سەرهەڵدانی فیتنە:**

عنْ حذيفة بن اليمان (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرّ، فَجَاءَنَا اللَّهُ بِهَذَا الْخَيْرِ، فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: (نَعَمْ). فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ). قُلْتُ: وَمَا دَخَنُهُ؟ قَالَ: (قَوْمٌ يَسْتَنُّونَ بِغَيْرِ سُنَّتِي وَيَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي، تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ، فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرّ؟ قَالَ: (نَعَمْ، دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صِفْهُمْ لَنَا. قَالَ: (نَعَمْ، قَوْمٌ مِنْ جِلْدَتِنَا وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا تَرَى إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: (تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ). فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلَا إِمَامٌ؟ قَالَ: (فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ، حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ). [البخاري / المناقب /٣٤١١]

واتە: حذيفة ی کوڕی اليمان (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: خەڵکی لەبارەی چاکەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، منیش لەبارەی خراپەوە پرسیارم لێدەکرد لە ترسی ئەوە نەبادا تووشم ببێت، وتم: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) ئێمە پێشتریش لە نەفامی و خراپەدا بووین، الله ئەم چاکەیەی بۆ هێناین، ئایا لەدوای ئەم چاکەیە خراپە هەیە ؟ فەرمووی: (بەڵێ). ئینجا عەرزم کرد:

ئایا لە دوای ئەو خراپەیەش چاکە هەیە ؟ فەرمووی: (بەڵێ هەیە، بەڵام لێڵی تێدایە) وتم: لێڵیەکەی چییە ؟ فەرمووی: (کەسانێك ڕەفتارێك دەکەن بەدەر لە ڕەفتار و سوننەتی من و شوێن ڕێنماییەك دەکەون بەدەر لە ڕێنمایی من، هەندێ شتیان پێ چاکە و هەندێ شتیشیان پێ خراپە). دیسان وتم: ئایا لە دوای ئەم چاکەیەوە خراپە هەیە ؟ فەرمووی: (بەڵێ بانگەوازکەرانێك هەن لەسەر دەرگای دۆزەخ ەستاون، هەر کەس بچێت بەدەم بانگەوازەکەیانەوە فڕێی دەدەنە ناوی). دووبارە وتم: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) وەسفیان بکە بۆمان، فەرمووی: (بەڵێ، کەسانێکن لە خۆمان و بە زمانی خۆشمان قسە دەکەن) وتم: ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم)، چ دەفەرمووی پێم بکەم ئەگەر ئەمەم تووش هات ؟ فەرمووی: (دەست بگرە بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە)، ئینجا وتم: ئەی ئەگەر نە کۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا ؟ فەرمووی: (خۆت بە دوور بگرە لە هەموو گروپەکان، با بە تەنهاش قەپ بکەی بە بن دارێکدا، هەتا مردن یەخەت دەگرێ تۆ لەسەر ڕاستی بە).

## * ونتبع السنة والجماعة، ونجتنب الشذوذ والخلاف والفرقة *

هەروەها شوێن سوننەت و کۆمەڵی موسڵمانان دەکەوین، و دوور دەکەوینەوە لە ڕاجیاوازی و ناکۆکی و پارچە پارچە بوون.

الله عز وجل دەفەرموویت: (وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) (الانفال: ٤٦)

واتە: جا گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی الله و پەیامبەرەکەی بکەن و قرە قرِو کێشەش لەگەڵ یەکتردا مەکەن، هەتا هێزو تواناتان بچێ و، ئەوساش کزو لاوازو سست بین، هەروەها ئارامتان بێت - کاتێ بە دوژمن گەیشتن - چونکە دڵنیابن الله لەگەڵ ئارامگراندایە.

پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: ((فإنه مَن يعش منكم؛ فسوف يرى اختلافًا كثيرًا؛ فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي؛ تمسّكوا بها، وعضّوا عليها بالنّواجذ)) [رواه الإمام أحمد في "مسنده" (٤/ ١٢٦، ١٢٧)، ورواه أبو داود في "سننه" (٤/٢٠٠)، ورواه الترمذي في "سننه" (٣١٩/٧، ٣٢٠)؛ كلهم من حديث العرباض بن ساري رضي الله عنه].

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە بژی؛ ئەوا لە داهاتوودا خیلاف و دووبەرەکیەکی زۆر دەبینێت، جا دەست بگرن بە سوننەتی من و خولەفای ڕاشیدینی ڕێنوێنی کراوەوە لەدوای منەوە؛ دەستی پێوە بگرن و بە ددانەکانتان پارێزگاری لێبکەن.

وە ئەمە فەرمانە بۆ ئوممەتی ئیسلامی تاوەکو ڕۆژی دوایی و ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە لەسەر ڕێبازی سەلەف بڕۆین و ڕێبازی سەلەف گونجاوە بۆ هەموو سەردەمێك و جێگایەك.

هەروەها الله تبارك وتعالى فەرموویەتی: {وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ} [التوبة: ١٠٠].

واتە: ئەو کەسانەی کە لە پێشدا هەبوون لە کۆچکەران و سەرخەرانی ئیسلام و ئەوانەی کە بە جوانی شوێنیان دەکەوتن الله لێیان ڕازیە و ئەوانیش لە الله ڕازین.

جا ڕستەی: {اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ} واتە: ئەوانەی کە بە جوانی شوێنیان دەکەوتن، هەموو ئوممەتی ئیسلامی دەگرێتەوە تا ڕۆژی دوایی؛ بۆیە پێویستە لەسەر ئومەتی ئیسلامی شوێن ڕێبازی کۆچکەران و سەرخەرانی ئیسلام بکەوێت، هەروەها ئیمامی مالکی کوڕی ئەنەس

دەڵێت: کۆتایی ئەم ئوممەتە چاك نابێت تەنها بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پێ چاك بوو .

ئەو کەسەی دەیەوێت عیزەت بۆ ئوممەتی ئیسلامی بگێڕێتەوە و ئوممەت لە سەلەفی سالح دابڕێت، ئەوا کەسێکە شەڕی بۆ موسوڵمانان دەوێت و دەیەوێت دەستکاری ئیسلام بکات و دەیەوێت بیدعە و موخالەفات بێنێتە ئاراوە؛ پێویستە ئەم جۆرە کەسانە ڕەفز بکرێن و بەرپەرچ بدرێنەوە و خەڵك لە شەڕیان ئاگادار بکرێتەوە؛ چونکە پێویستە دەست گرتن بە ڕێبازی سەلەفی ساڵحەوە و شوێن کەوتنیان، هەروەها پێویستیشە لەسەر ڕێبازی سەلەف بڕۆین و ئەوەش لە قورئان و سوننەتدا هەیە هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

جا ئەو کەسەی دەیەوێت خەلەفی ئەم ئوممەتە لە سەلەفی پێشووی دابڕێت ئەوا کەسێکی موفسید و خراپەکارە لەسەر ئەرزدا، واجبە قسەی ڕەفز بکرێت و ئەو بۆچوونەی ڕەد بکرێتەوە و خەڵکی لێ ئاگادار بکرێتەوە.

هەروەها دوور دەکەوینەوە لە ڕاجیاوازی و پارچە پارچە بوون چونکە هەڕەشەی سەختی لەسەرە پارچە پارچە کردنی دین،

هەروەکو الله تعالی دەفەرموویت: (فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ) (فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ) (المؤمنون: ٥٣-٥٤)

واتە: بەڵام خەڵكی دینەكەیان لە نێوانی خۆیاندا بەش بەش و پارچە پارچە كرد و بوونە چەند حیزب و گروپێك، هەر حیزبێكیش بەو مەنهەج و پەیڕەو و پرۆگرامەی كە خۆی پێیەتی دڵخۆش و سەرسامە و وا دەزانن لەسەر هیدایەتن.

ئەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ! وازیان لێ بێنە با تا ماوەیەك لە زەلكاوی نەفامی و غەفڵەتی خۆیاندا قەتیس بمێنن، ئەوجا ئەوكاتە چاك دەزانن چییان پێدەكەم. (ئەم ئایەتانە بەڵگەیە لەسەر حەرامێتی پارچە پارچەیی و حیزبایەتی، چونكە الله تعالی بە خراپی باسی دەكات و زەمی دەكات).

بەڵگە زۆرە لەسەر حەڕامیەتی پارچە پارچە بوون و حیزب حیزبانێ بەڵام ئەوەندە بەسە بۆ كەسێك كە حەقی بوێت.

## * وأن الجهاد ماض منذ بعث الله نبيه إلى قيام الساعة مع أولي الأمر من أئمة المسلمين لا يبطله شيء، والحج كذلك *

هەروەها جیهاد کردن بەردەوامە لەو کاتەوەی کەوا الله تعالى پێغەمبەری نارد (صلى الله عليه وسلم) تاوەکو بەرپا بوونی قیامەت لەگەڵ وەلی أمر ـی موسوڵمانان، و هیچ شتێك هەڵیناوەشێنێتەوە، هەروەها حەج ـیش بەهەمان شێوە.

الله جل جلاله دەفەرموویێت: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ) (البقرة: ١٩٣)

واتە: لە کوشتنیان کۆڵ مەدەن هەتا ئاژاوە و فیتنە لەناو دەچێ و، هێزو تواناشیان نامێنێ عەزیەت و ئازاریشتان بدەن و، بۆ خۆیان سەرشۆڕو ڕیسوا دەبن.

هەروەکو لە حەدیسە سەحیحەکاندا هاتووە جیهاد کردن دەمێنێت و کۆمەڵێك لەسەر حەق دەمێننەوە تاکو قیامەت دێت.

عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ شِمَاسَةَ الْمَهْرِيُّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مَسْلَمَةَ بْنِ مُخَلَّدٍ، وَعِنْدَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو ابْنِ الْعَاصِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ، هُمْ شَرٌّ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ، لَا يَدْعُونَ

اللَّهَ بِشَيْءٍ إِلَّا رَدَّهُ عَلَيْهِمْ. فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ أَقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ (رضي الله عنه)، فَقَالَ لَهُ مَسْلَمَةُ: يَا عُقْبَةُ اسْمَعْ مَا يَقُولُ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ عُقْبَةُ: هُوَ أَعْلَمُ، وَأَمَّا أَنَا فَسَمِعْتُ رَسُولَ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: (لَا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِ اللَّهِ، قَاهِرِينَ لِعَدُوِّهِمْ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ). فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَجَلْ. (ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ رِيحًا كَرِيحِ الْمِسْكِ، مَسُّهَا مَسُّ الْحَرِيرِ، فَلَا تَتْرُكُ نَفْسًا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنَ الْإِيمَانِ إِلَّا قَبَضَتْهُ، ثُمَّ يَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، عَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ).
[صحيح مسلم]

واته: عبدالرحمن ی کوڕی شماسة المهري دەڵێ: لای (مسلمة ی کوڕی مخلد) بووم، (عبدالله ی کوڕی عمر) یشی لا دانیشتبوو، عبدالله وتی: قیامەت هەڵناسێت مەگەر لەسەر خراپانی خەڵکی، کە لە خەڵکی سەردەمی نەفامی خراپترن. هەر نزا و پاڕانەوەیەکیش بکەن الله لێیان وەرناگرێت و دەیداتەوە بەسەریاندا. لە کاتێکدا ئەوان لەم قسە و باسانەدا دەبن (عقبە ی کوڕی عامر) یش بەرەو لایان دێت ، مسلمة دەڵێ: ئەی عقبة گوێ بگرە لەوەی کە عبدالله دەیڵێت. عقبة یش دەڵێ: ئەو لە من زاناترە، بەڵام من لە پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) بیستووە کە دەیفەرموو: (بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتەکەم لەسەر فەرمانی الله دەجەنگن دوژمنیان دەبەزێنن و نەیارانیان ناتوانێت زیانیان لێبدەن تاوەکو قیامەت دێت و ئەوان هەر لەسەر ئەو بارە دەبن). عبدالله

دەڵێ: بەڵێ وایە. (پاشان الله بۆنێکی وەك بۆنی میسك دەنێرێت بەرکەوتنی لەسەر لەش وەك بەرکەوتنی ئاوریشم وەهایە هیچ بەندەیەك ناهێڵێتەوە کە لە دڵیدا بە ئەندازەی کێشی دانەوێڵەیەك باوەڕ هەبێت ئەوا گیانی دەکێشێت، پاشان خراپانی خەڵکی دەمێنێتەوە و قیامەت لەسەر ئەوان هەڵدەستێت).

عَنْ ثَوْبَانَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم): (لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ) (بخارى/المناقب/٣٤٤١، ٣٤٤٢)

واتە: ثوبان (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتەکەم لەسەر حەق دەمێنن و نابەزن و کەسێك بیەوێت سەرشۆڕیان بکات ناتوانێت زیانیان لێبدات تاوەکو فەرمانی الله بە مردنیان دێت و ئەوان هەروا دەبن).

عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم): (لَا يَزَالُ أَهْلُ الْغَرْبِ ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ). [صحيح مسلم]

واتە: سعد ی کوڕی أبي وقاص (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەردەوام خاوەن دۆڵچە

گەورەکان مەبەست پێی خەڵکی عەرەبستانە یان شامە بەردەوام دەبن لەسەر حەق و پشتیوانی لێدەکەن تا قیامەت هەڵدەسێت).

جا سەبارەت بە حەجیش الله تعالی قیبلەیەکی بۆ موسوڵمانان داناوە بۆ ئەوەی لەکاتی عیبادەتەکاندا ڕووی لێ بکەن کە ئەویش لەشاری مەککەی پیرۆزە: (فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ) (البقرة: ١٤٤) دەی ئێستا ڕووتان وەرگێڕن بۆ کەعبەی پیرۆز، کە لەناو نوێژی عەسردا بوون ڕوویان وەرگێڕا بۆ کەعبەی پیرۆز، یاخود دوو ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆیان کردووە ڕووە و قودس پاشان دوو ڕکاتەکەی تر ڕوویان لە قیبلە کردووە لە مزگەوتی بەنی سەلەمە بۆیە پێی دەوترێت مزگەوتی قیبلەتەین، بەڵام مزگەوتی (قوباء) لە ڕۆژی دواتر هەواڵیان پێ گەیشت لەناو نوێژی بەیانی بوون ڕوویان وەرگێڕا بۆ کەعبەی پیرۆز، جا ئێوەش ئەی موسڵمانان لە هەر شوێنێکدا بوون ئیتر لە نوێژ کردنتاندا ڕووبکەنە کەعبەی پیرۆز.

جا الله حەجی فەرز کردووە لەسەر هەموو موسڵمانێکی بالغی عاقڵ کە توانای هەبێت، الله تعالی فەرموویەتی: (وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ) (آل عمران: ٩٧)

واتە: حەقی الله تعالی یە بەسەر بەندەکانی کە لە تەمەندا جارێك حەجی ماڵی الله بکەن، هەر کەسێ توانای هەبێ توانای لاشە و جەستە و پارە، هەروەها ڕێگا ئەمن و ئاسایش بێ، جا هەر کەسێك کە کوفر بکات واتە: حەج نەکات و باوەڕی بە حەج نەبێ ئەوا الله تعالی بێ پێویستە و دەوڵەمەندە و پێویستی بە هیچ کەس نییە لە جیهان. **بەم ئایەتە حەج فەرز بوو.**

حەج وەرزێکە کە بانگەوازی موسوڵمانان تیایدا دەردەکەوێت و هێز و قوەت و یەك بوونیان تیایدا بەدیار دەکەوێت بەوەی کە تەنیا الله دەپەرستن و شوێن یەك پێغەمبەر دەکەون و تەنانەت یەك جل لەبەر دەکەن.

## * ودفع الصدقات من السوائم إلى أولي الأمر، من أئمة المسلمين *

هەروەها پێدانی خەیر و ئەو ئاژەڵانەی کەوا زەکاتیان تێدایە بۆ کاربەدەستانی موسوڵمانان.

زەکات ڕوکنی سێیەمی ئیسلامە، واجبە لەسەر هەر موسوڵمانێکی ئازادی خاوەن ئەو ماڵەی کە گەیشتۆتە ئەندازەی زەکات (النصاب) ئەگەر ساڵێکی کۆچی بەسەردا تێپەڕی، جگە لە کشتوکاڵ کە زەکات تێیدا فەرز دەبێت لەکاتی دروونەوەیدا ئەگەر گەیشتبێتە ئەندازەی خۆی.

**ئەو ماڵانەی کە زەکاتیان تێدا واجبە:** زەکات واجبە لە: زێڕ و زیو (پارە)، و دانەوێڵە، و مەڕوماڵات، و خەزێنەی دۆزراوەی سەردەمی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام.

جا زەکات نەدان یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و مرۆڤ بە نەدانی دەچێتە دەرەوە لە ئیسلام و پێی کافر دەبێت. الله تعالى دەفەرمووێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾ (التوبة: ١٠٣) واتە: لە سامانەکانیان زەکات وەربگرە.

پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) زەکاتی وەردەگرت لە موسڵمانان تا مابوو بەڵام کە وەفاتی کرد و ابوبکر (رضي الله عنه) بووە خەلیفە کەسانێك کە پێشتر زەکاتەکانیان دەدا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ووتیان: ئەم زەکاتە نادەینە ابوبکر چونکە ئەمە بەس تایبەت بوو بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

لە سەحیحی بوخاری هاتووە سەحابەی بەڕێز ابو هریرة (الله لێی ڕازی بێت) دەڵێت: لە پاش وەفاتی رسول الله **(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)** کە ابوبکر (الله لێی ڕازی بێت) بووە خەلیفە، ئەوەی کوفری کرد و کافر بوویەوە لەناو عەرەب، جا ئیمامی عومەر (الله لێی ڕازی بێت) ووتی: ئەی ابوبکر چۆن خەڵك دەکوژی ئەی رسول الله **(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)** نەیفەرموو (من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا شەهادە دێنن، گەر ووتیان خوێن وماڵیان پارێزراوە لە من نایانکوژم ئیلا گەر شتێك بکەن حەدی کوشتن بێت، حیسابیشیان لای الله یە ؟) ئیمامی ابوبکر (الله لێی ڕازی بێت) ووتی: والله هەر کەسێك جیاوازی بکات لە نێوان نوێژ و زەکات قیتالی دەکەم چونکە زەکات مافی ماڵە، والله گەر بێت و زەکاتەکەیان کاریلەیەکیش بێت کە پێشتر دەیاندا بە رسول الله **(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)** بەڵام ئێستا نەیدەنە من قیتالیان دەکەم لەسەری. دواتر ئیمامی عومەر فەرمووی: الله سینەی ابو بکری

ڕوون کردەوە بۆ کوشتاریان، هەروەها منیش زانیم کە ابو بکر حەقە.

صحيح البخاري.

حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ ، حَدَّثَنَا اللَّيْثُ ، عَنْ عُقَيْلٍ ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ ، أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ : لَمَّا تُوُفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ : يَا أَبَا بَكْرٍ، كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " : أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ .فَمَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ .عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ ." قَالَ أَبُو بَكْرٍ : وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ ؛ فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا . قَالَ عُمَرُ : فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ أَنْ قَدْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ.

سەیر بکەن، ئەمانە باوەڕیان بە زەکات هەبوو وە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەروەك بینیت ابوبکر (الله لێی ڕازی بێت) ووتی (كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واتە: پێشتر دەیاندا بە رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەڵام ئێستا (مَنَعُونِي) واتە: نایدەنە من.

ابن كثير (رحمه الله) دەڵێت: هەندێك لە زەكات نەدەرەكانی سەردەمی ابوبكر بیروباوەڕیان وابوو كەوا زەكات بە ئیمام نادرێت بەڵكو ئەم زەكات دانە تەنیا تایبەت بوو بە رسول الله ﷺ بۆیە پشتیان بەست بەو ئایەتە كە الله فەرمووی ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾ بەڵام ابوبكر و تێكڕای سەحابەكان ڕەدی ئەم تەئویل و تێگەیشتنە پووچەیان دانەوە و كوشتاریان كردن هەتا زەكاتیان دا بە خەلیفە هەروەك چۆن پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەر ﷺ ، ابوبكری ڕاستگۆش (رضي الله عنه) ووتی: والله گەر زەكاتەكەیان پەتێك یان گیسكێكیش بێت كە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڵام ئێستا نەیدەنە من كوشتاریان دەكەم لەسەر نەدانی.

قال ابن كثير: اعْتَقَدَ بَعْضُ مَانِعِي الزَّكَاةِ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ أَنَّ دَفْعَ الزَّكَاةِ إِلَى الْإِمَامِ لَا يَكُونُ، وَإِنَّمَا كَانَ هَذَا خَاصًّا بِرَسُولِ اللَّهِﷺ ؛ وَلِهَذَا احْتَجُّوا بِقَوْلِهِ تَعَالَى :﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾ وَقَدْ رَدَّ عَلَيْهِمْ هَذَا التَّأْوِيلَ وَالْفَهْمَ الْفَاسِدَ الصَّدِيقُ أَبُو بَكْرٍ وَسَائِرُ الصَّحَابَةِ، وَقَاتَلُوهُمْ حَتَّى أَدَّوُا الزَّكَاةَ إِلَى الْخَلِيفَةِ، كَمَا كَانُوا يُؤدونها إِلَى رَسُولِ اللَّهِﷺ ، حَتَّى قَالَ الصِّدِّيقُ :وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقالا وَفِي رِوَايَةٍ : عَنَاقًا يُؤَدُّونه إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى مَنْعِهِ. (تفسير القرآن العظيم)

* والناس مؤمنون في أحكامهم وموارثهم، ولا يدري ماهم عند الله فمن قال إنه مؤمن حقا فهو مبتدع، ومن قال إنه مؤمن عند الله فهو من الكاذبين، ومن قال أني مؤمن بالله فهو مصيب *

هەروەها خەڵكی لە باوەڕداران لە ڕووی حوکمدان و میراتگرییەوە، جا نازانین ئەو کەسانە لای الله چۆنن، هەرکەس بڵێت من بە حەق ئیماندارم ئەوە بیدعەچییە، وە هەرکەس بڵێت من ئیماندارم لای الله ئەوە لە درۆزنەکانە، بەڵکو ئەوەی بڵێت من ئیماندارم بە الله ئەوە پێکاوییەتی و ڕاست دەکات.

عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەت وایە هەر کەس زاهیرەن شەعائیری ئیسلامی نیشاندا و هیچ کوفر و شیرکی لێ بەدەر نەکەوت ئەوا حوکم بە زاهیر دەدرێت و حسابی موسڵمانی بۆ دەکرێت ئەم کەسە. بەڵام نازانین ئاخۆ ئەو کەسە لای الله موسڵمانی حەقیقی یە یان نا، بۆیە ناخی کەسەکان بۆ الله تعالی جێ دەهێڵین و حوکمی زاهیر دەدەین بەسەر ئەو کەسانەی کە ئیسلام نیشان دەدەن.

هەروەکو الله تعالی لە بارەی اعرابییەکانەوە دەفەرموویت: (قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَـٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ

فِي قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (الحجرات: ١٤)

واته: عەرەبە دەشتەكییەكان وتیان: بڕوامان هێناوە بە الله و بە پەیامبەری الله، بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە بەڵام بڵێن: هەر لە ترسی كوشتن و دیل بوون موسڵمان و ملكەچ بووین، بڕوا هێنان هەیە و خۆ بەدەستەوەدان هەیە، ئەوەی ئێوە تەنها سەرزارییە و، لە دڵدا ڕاست ناكەن، هەر لەبەر ئەمەیشە كە هەندێ لە زاناكان دەڵێن: ئیمان و ئیسلام دوو زاراوەی جیاوازن. لەكاتێكی گرانی و وشكەساڵدا دەستەیەك لە عەرەبە دەوارنشینەكان هاتنە مەدینە و منەتیان بەسەر پەیامبەر (صلى الله علیه و سلم) نا، كە موسڵمان بوون، وتیان: ئەی پەیامبەری الله ! بڕوامان هێناوە، ئێمە وەك هۆزی فلان و فلان جەنگت لەگەڵ ناكەین بەڵێ، لەو قسە و باسانەیان زۆر گوت ! ئەوجا ئەم ئایەتە: (وقالت الاعرب آمنا..) هات. جا ئایەتەكە بە ڕاشكاوی گەیاندی كە وشە و مانای بڕوا (إیمان) گەلێ فراوانترو گەورەترە لە وشە و مانای ئیسلام .. چونكە باوەڕ (إیمان) بە دڵ و بە زمان و بە كردەوە (اعتقاد، قول، عمل) دەبێت، بەڵام ئیسلام بوون بە خۆ بەدەستەوەدان و ملكەچ بوونێكی ڕواڵەتیش دەبێ، جا الله هۆشیاری كردنەوە كە ئیمانی ڕاستەقینە دەبێ كردەوەش پشتگیری بكات. (ولما یدخل الإیمان في قلوبكم) وە هێشتا بڕوا نەچووەتە نێو دڵتانەوە (وإن

تطيعوا الله ورسوله لا يلتكم من أعمالكم شيئا) ئەگەر گوێڕایەڵی الله و پەیامبەری الله بن، ئەوا الله ش هیچ شتێك لە پاداشتی کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە و بە تێرو تەسەلی پاداشتتان دەداتەوە (إن الله غفور رحيم) بەڕاستی الله زۆر لێبوردە و میهرەبانە.

جا بۆیە لە ئیسلامدا حوکم بە زاهیر دەدرێت و دڵ و ناخی کەسەکان بۆ الله تعالی جێ دەهێڵین. هەر کەسێك فەرائیزەکانی ئیسلام جێبەجێ بکات ئەوا حیسابی موسڵمانی بۆ دەکرێت تاکو کوفر و شیرکی لێ نەبینرێت ئەگەرچی لە ناخییەوەش باوەڕی بەو شتانە نەبێت کە دەیکات. جا ئەو کەسەی هەموو فەرائیزاکان جێبەجێ دەکات و باوەڕیشی پێی نییە ئەوە هەر خۆی لە ئاخیرەتدا زەرەرمەند دەبێت.

هەروەها هەر کەسێك بڵێت من بە حەق ئیماندارم ئەوە بیدعەچییە، چونکە ئێمە لە بەشی (ئیمان زیاد و کەم دەکات) ڕوونمان کردەوە کە ئیمان جێگیر نییە و عەقیدەی ئەهلی سوننە وایە کە ئیمان زیاد و کەم دەکات و کۆمەڵێك بەڵگەشمان لەسەر ئەم باسە هێنایەوە.
بۆیە ئەو کەسەی کە بڵێ بە حەق ئیماندارم بیدعەچییە چونکە ئیعلانی ئەوەی کردووە کە کەسێکە خاوەن ئیمانێکی کامڵە و ئیمانی زیاد و

کەم ناکات، ئەمەش پێچەوانەی قورئان و عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەیە و یەکێکە لە سیفەتەکانی خەواریج و موعتەزیلە.

بەڵکو ئەم قسەیە تەنیا بۆ الله تعالی یە و خۆی بڕیار دەدات کە کێ بە حەق ئیمانداره و کێ بە حەق کافرە، هەروەکو دەفەرموویێت: (أُولَـٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا) (الانفال: ٤) واته: باوەڕدارانی ڕاستەقینە هەر ئەوانەن.

هەروەها دەفەرموویێت: (أُولَـٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا) (النساء: ١٥١)

واته: بێ دوو دڵی ئەوانە کافرو بێ باوەڕن.

کەواتە بڕیار دان لەسەر ئەوەی کێ موسڵمانی حەقە و کێ کافری حەقە تەنیا بۆ الله تعالی یە و بۆ مەخلوقەکان نییە ئەم بڕیارە بدەن.

هەروەها هەر کەس بڵێ ئیماندارم لای الله ئەوە لە درۆزنەکانە.

زانایانی سەلەف نەهییان کردووە کە بڵێین لای الله تعالی ئیماندارم چونکە هیچ کەسێکمان نازانین حاڵمان چۆنە لای الله تعالی.

بەڵکو قسەی ڕاست و دروست ئەوەیە بڵێین ئیمانداریین بە الله تعالی، هەروەها باوەڕمان بە هەموو ڕوکنەکانی ئیسلام و ئیمان هەیە، بەڵام نازانین ئاخۆ لای الله تعالی حاڵمان چۆنە و تەنیا الله عز وجل زانایە بە حاڵی بەندەکانی.

جا ئەوەی دەڵێ ئیماندارم لای الله ئەوە ئەم کەسە لەناو ئیرجاء و گومڕایی دەژی، چونکە مورجیئەکان کردەوە لە ئیمان دەبەنە دەرەوە و لای ئەوان وایە هەموو کەسێك لە ئیماندا وەکو یەکە و تەنانەت لای ئەوان هەموو کەسێك ئیمانی وەکو سەحابەکانی رسول الله (صلی الله علیه وسلم) وایە، جا ئەمەش جۆرێکە لە گومڕایی پەنا بە الله. بۆیە عەقیدەی ئەهلی سوننە وایە کە بڵێین ئیمانداریں بە الله تعالی بەڵام نازانین حاڵمان چۆنە لای الله تبارك وتعالی.

## * والمرجئة مبتدعة ضلال *

مورجیئەکان بیدعەچی و گومڕان.

**ئیرجاء :** وشەی (المرجئة) لە دواخستنەوە هاتووە، بە مانای دواخستنی کردەوە لە باوەڕ دێت.

وشەی **(الإرجـاء)** دوو مانای هەیە :

**یەکەم :** دواخستن.

**دووەم :** بەخشینی تکاکاری.

**مورجیئەکان :** یەکێکن لە تاقمە کەلامیەکان لە بواری ئیمانەوە تێکەوتوون، هەروەها لەناوخۆشیاندا یەك نین.

ئەمانە پێیان وایە کەسێك لە دڵەوە مادەم بڕوادارە کردەوەشی نەبێت ئەهلی بەهەشتە، ئەو قسانەی زۆر باوە لەلایان ئیمان بریتییە لە گوفتاری زمان، مادەم گەر بە زمان بڵێن ئیمانداریین ئەگەر بە دڵیش ئیمانی نەبێت هەر بڕوادارە، هەروەها دەڵێن ئیمانی گوفتارو زمان بەڕاست دانانی دڵە، هەروەها وا دەزانن ئیمان زیاد و کەم نابێت !.

(مورجیئەکان) وەك ئیمام أحمد (رحمە اللە) دەڵێت: ئەو کەسانە دەگرێتەوە، کە پێیان وابوو باوەڕ دەربڕینە بە زمان و بەس ، خەڵکی هەموو وەك یەك باوەڕیان هەیە کەسیان لە کەسیان زیاتر نییە، کەواتە

لەلای ئەوان فریشتە و پێغەمبەران (علیهم السلام) و خەڵکی سادە هەموو وەك یەك باوەڕیان هەیە و باوەڕ نە زیاد دەكات و نە كەم دەكات و هەركەسێ بە زمان شایەتومان بهێنێ ئەوە باوەڕدارە با یەك كردەوەی چاكیشی نەبێت.

(مورجیئە) تۆخەكان (غلاة) دەڵێن: لەگەڵ بوونی باوەڕدا گوناهـ زیانی نییە، هەروەك چۆن لەگەڵ بێ باوەڕیدا كردەوەی چاك سوودی نییە، ئەمەش بۆچوونی (جهم بن صفوان) و هاوڕێكانی بوو.

## * والقدرية مبتدعة ضلال، ومن أنكر منهم أن الله يعلم ما يكون قبل أن يكون فهو كافر *

هەروەها قەدەرییەکان بیدعەچی و گومڕان، هەروەها هەرکەس نکۆڵی ئەوە بکات کە الله هەموو شتێك دەزانێت پێش ئەوەی ڕوببدات ئەوە کافرە.

**قەدەرییەکان :** قەدەرییەکان لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا (الله لێیان ڕازی بێت) سەریانهەڵدا، قەدەرییەکان ئەوانەن کە نەفی قەدەریان دەکرد و ئینکاری قەدەریان دەکرد، و دەیانگوت: هەرچی لەم بوونەوەرەدا ڕوودەدات بە قەزا و قەدەری الله نییە، بەڵکو بەهۆی کرداری بەندەکان خۆیانەوەیە، هەروەها ویستی الله ـی لەسەر نەبووە لەپێشدا. قەدەرییەکان شوێنکەوتەی (معبدی الجهنی و غیلان دیمەشقی) بوون، هەروەها دەیانگوت: مرۆڤ خۆی بەدیهێنەرە لە ئەنجامدانی کردەوەکانی و قەدەر و چارەنووسەکانی خۆی و تاوان و سەرپێچییەکانی، هەروەها مرۆڤ خۆی موخەییەر و سەرپشك نییە، ئەمەش پێچەوانەی مەنهەجی ئەهلی سوننەیە، کە ئەهلی سوننە پێیان وایە : مرۆڤ هەم **(مُسَيَّر)** ـە واتە: بۆیان دیاری کراوە، و هەم **(مُخَيَّر)** ـە ، واتە : سەرپشکە لە هەندێك قەدەر ـدا، (مسير) ـە وەك :

مردن و نەخۆش بوون و جگە لەمانەش ، وە (مخير) ـە لە ئەنجامدانی سەرپێچی و تاوان و جگە لەمانەش.

هەروەها قەدەریەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەوا مرۆڤ خۆی توانا و دەسەڵاتی هەیە، و ویست و مەشیئەتی هەیە، وە هێز و قودرەتی هەیە، هەروەها مرۆڤ خۆیان خاوەنی خێر و چاکە و شەڕ و خراپەن، و خۆیان خاوەنی سوود و زیانن، هەروەها گوێڕایەڵی و سەرپێچی، و هیدایەت و گومڕایی، هەروەها بەندەکان خۆیان کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدەن و بەدی دەهێنن، بەبێ ئەوەی کە لەمەدا پێشینەیەکیان هەبێت لە عیلمی الله تعالی ـدا. جا قسەکانیان هاوشێوەیە لەگەڵ قسەی مەجوسیەکان و نەصرانیەکان، و ئەوەیش ئەسڵی زەندیقایەتییە. (السنة ى الكرماني: ژمارەی ٩٣)

هەروەها پێشەوا مالك ـی کوڕی ئەنەس (ڕەحمەتی الله لێی بێت) دەفەرمووێت: قەدەریەکان نیکاح و هاوسەرگیریان لەگەڵدا ناکرێت، و نوێژ لەدوایانەوە ناکرێت، و قسەیان لێ وەرناگیرێت، و ئەگەر لەسەر لێوارێکەوە بینیتان هەڵیان بدەنە ناویەوە.
(القضاء والقدر : ٤٦٧)
هەروەها زۆرێك ئەم ناوی قەدەریە دەدەن بەسەر موعتەزیلەکانیشەوە.

## * وأن الجهمية كفار *

هەروەها جەهمییەکان کافرن.

**جەهمیەکان :** ئەوانەن کەوا پەکخەر و ڕەتکەرەوەی سیفاتەکانی الله تعالی ـن، پێیان دەگوترا: جەهمیەکان، کە دەدرانە پاڵ: جەهمی کوڕی صەفوان، أبو محرز، مەولای بني راسب، هەندێك کەس نازناوی (الترمذي)ـیان لێ نابوو، (تێبینی: مەبەست لە الترمذي ڕاوی فەرموودە نییە) هەروەها هەندێکی تر نازناوی سەمەرقەندی ـیان لێ نابوو، بەڵام شوێنکەوتووەکانی بە جەهمیەت دەناسرێنەوە، وەك درانە پاڵیان بۆ لای جەهمی کوڕی صەفوان، لەپاشاندا ئەمە بووە نازناوێك بۆ ئەو کەسانەی کە نەفی تەواوی سیفاتەکانی الله تعالی ـیان دەکرد، بە إعتباری ئەوەی کە جەهمیەکان یەکەم تاقم بوون کە نەفی سیفاتەکانی الله سبحانە وتعالی ـیان کرد و ڕەتیان کردەوە.

هەروەها دەیانگوت: ئیمان تەنها بەڕاست دانانی لە دڵەوە بەسە کە لە کەسێکدا هەبێت، و بە مەرجیان دادەنا بۆ کەوتنە ناو کوفرەوە تەنها إستحلال و حەڵاڵ کردن لە دڵەوە.

## * والرافضة رفضوا الإسلام *

ڕافیزەکان ڕەفزی دینی ئیسلامیان کردووە.

**ڕافیزەکان :** ڕافیزی: نازناوێکە زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین داویەتی بەسەر ئەو کەسانەی کە لێی جودابوونەوە و تەفرەقەیان دروست کرد، لەوانەی کە لە کوففە بەیعەتیان پێی دابوو، لەبەرئەوەی نکۆڵی دەکرد لێیان لەوەی کە تانە و تەشەر بدەن لە پێشەوا أبوبکر و پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب (الله لێیان ڕازی بێت) ، أبو حەسەنی ئەشعەریش لە کتێبی (المقالات) ئەم نازناوەی داوە بەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە ڕەفزی خیلافەتی هەردوو خەلیفەی پێغەمبەریان دەکردەوە (صلى الله عليه وسلم) کە ئەوانیش أبوبکر و عومەری کوڕی خەطاب بوون.

بۆ زانیاری زیاتر سەیری ئەم کتێبانە بکە:

(مقالات الإسلاميين: ١٦)
(البرهان في معرفة عقائد أهل الأديان: ٣٦)
(خطط المقريزي: ٢/٣٥١)

هەروەها ڕافیزە یەکێکە لە تاقمەکانی شیعە، هەروەها مەزهەبەکەیان بەرپاکردووە لەسەر جنێودان بە أبوبکر و عومەر و عوسمان (الله لێیان ڕازی بێت) ، هەروەها لەسەر جنێودان بە دایکی ئیمانداران عائیشە (الله لێی ڕازی بێت) و تانە و تەشەردان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان (الله لێیان ڕازی بێت) بە هەڵبەستنی چەندین درۆ و بوهتان بۆیان بەوەی کە شایەن نییە پێیان، هەروەها بانگەشەی دووربوون لە گوناهـ و تاوان (مەعصوم) بۆ پێشەواکانیان دەکەن بەشێوەیەك کە لە پێگە و پلەو و پایەی پێغەمبەران دایاندەنێن، بەڵکو تەنانەت پێشەوا عەلی (الله لێی ڕازی بێت) دەپەرستن لەشوێنی الله عز وجل، هەروەها قورئانیان گۆڕیوە و تەحریفیان کردووە، هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن کە (ئەو قورئانە گۆڕدراوەی لەلایانە) بریتییە لە قورئانی فاتیمە، هەروەها ڕافیزیە موشریکەکان لەکاتی ناخۆشی و سەختی و تەنگانەکانیاندا هانا و هاواری پێشەوا عەلی و فاتیمە دەکەن لەجیاتی الله تعالی، هەروەها بە ئەهلی سوننەیان دەگوت: نەواسب (نواصب)، جا تاقمی شیعە لە سەرەتادا ڕافیزە و زەیدیەکان و جگە لەوانیش بووە، بەڵام لەم سەردەمەی ئێستاماندا هەموویان لەسەر دینی ڕافیزەن، هەروەها زیاد لەوانەشی کە باسکرا مەرقەد و قەبر پەرستن.

شێخ عبد اللطیف کوڕی عبد الرحمن کوڕی حسن آل الشیخ (ڕەحمەتی الله لێی بێت) دەفەرموێت: مەرقەدی حوسەینیان هەیە و

ڕافیزە ئەم مەرقەدەی وەك بت لێ كردووە ، بەڵكو كردوویانە بە پەروەردگارێكی هەڵسوڕێنەر، جا بەهۆیەوە دینی مەجوسیەتیان گەڕاندۆتەوە، هەروەها سەردەمی لات و عوززا و ئەوەی ئەهلی جاهیلییەت لەسەری بووینە زیندوویان كردۆتەوە، وە بەهەمان شێوە مەرقەدی عەباس و مەرقەدی عەلی ... جا ڕافیزە نوێژ بۆ ئەو مەرقەدانە دەكەن، و ماڵ و سامان و نەزرەكانیان بۆ ئەم مەرقەدانە خەرج دەكەن. (مجموعة الرسائل والمسائل النجدية)

شيخ الإسلام إبن تيمية (رەحمەتی الله لێی بێت) دەفەرموویت: ڕافیزیەكان دڵەكانیان پڕە لە بوغز و كینە بەرامبەر گەورە و بچوك لە موسڵمانان و پیاو چاكەكانیان و غەیری پیاو چاكەكانیان، جۆرە ڕقێك كە لە دڵی كەس نییە. (الفتاوى: ٤٨٨/٢٨)

هەروەها فەرموویەتی: ڕافیزە بنچینەی هەموو فیتنە و ناخۆشیەكانن، و زۆربەی ئەو شمشێرانەی بەر گەردەنی موسڵمانان دەكەوێ هەمووی لە ڕێگەی ئەوانەوە بووە، و ئەو كەسەشی دینی ڕافیزەی دامەزراند عبدالله كوری سەبەئـ ی زەندیقی مولحیدی بە ڕەگەز یەهودی بوو و دوژمنی ئیسلام بوو. (منهاج السنة: ٣٦٢/٤)

ئیمامی طەڵحەی کوڕی موصەریف (رەحمەتی الله لێی بێت) دەفەرمووێت: ڕافیزیەکان ئافرەتەکانیان مارە ناکرێت، و سەربڕاویشیان ناخورێت، لەبەرئەوەی ڕافیزیەکان ئەهلی ڕیدده و هەڵگەڕاوەن.

(الإبانة الصُغرى : إبن بُطّة)

## * والخوارج مراق *

خەواریجەکان دەرچوون لە دین.

**خەواریجەکان :** الخوارج " کـــ جمع ـــۆی ووشەی " خارجة "، واتە: (تاقمی دەرچوو ــ دەرچووەکان)، ئەم تاقمەیە لە بنچینەدا: هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە خروجیان کرد و دەرچوون لە گوێڕایەڵی کردنی پێشەوا عەلی کوڕی أبو طالب (الله لێی ڕازی بێت)، لەو کەسانەی کە لەگەڵی بوون لە جەنگی (صفین)، سەرەتا هەر خۆیان ڕازی بوون لەسەر دادوەری و حوکم کردن لەلایەن پێشەوا عەلی ـەوە، کەچی پاشان گوتیان پێی: بۆچی تۆ حوکم و دادوەری لە نێوان پیاوەکان دەکەیت ؟ " لا حکم إلا لله " هیچ حوکم و دادوەری کردنێك نییە تەنها بۆ الله نەبێت.

هەروەها پێیان دەگوترا: (حرورية ــ حەروریەکان) لەبەر خۆ دانە پاڵیان بۆ لای ناوچەی (حروراء) لەدوای پاشەکشە و گەڕانەوەیان لە جەنگی (صفین)، لەو ڕۆژەدا ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی دوانزە هەزار کەس. ئینجا پێشەوا عبدالله ـی کوڕی عەباس (الله لێی ڕازی بێت) چوو بۆ مونازەرە و گفتوگۆ کردن لەگەڵیان، زۆرێکیان گەڕانەوە، ئەوانەشی کە مانەوە جەنگیان کرد هەتاوەکو شکستیان هێنا، پاشان

خەواریجەکان بوونە چەندین دەستە و تاقم، بەڵام هەموویان ئەم ڕاو بۆچوونە کۆیان دەکاتەوە: تەکفیر کردنی پێشەوا عەلی کوڕی أبو طالب و پێشەوا عوسمانی کوڕی عەفان و هاوەڵانی جەنگی (الجمل)، و هەر کەسێکیش ڕازی بێت بە تەحکیم و دادوەری کردن، و یان ئەو کەسەی حاکمەکان یان یەکێکیان بەڕاست بزانێت، هەروەها تەکفیری ئەو کەسانەش دەکەن کە خاوەنی گوناهی گەورەن، هەروەها ئەم ڕاو بۆچوونەشیان هەیە کەوا ئەگەر ئیمام و پێشەوا ستەمێکی کرد دەبێت خروج بکەی و دەربچی لە گوێڕایەڵی کردنی. هەروەها هەموو ئەو کەسانەشی کە لەدوای ئەمانەوە دێن لەوانەی کە هەڵگری بنچینە و أصولەکانیانن، یان پەیڕەوی مەزهەبەکەیان دەکات ئەوا ئەویش بە هەمان شێوە کەسێکی خاریجی و دەرچووە.

هەروەها بۆ زانیاری زیاتر لەبارەیان سەیری ئەم کتێبانە بکە:

(الملل والنحل: ١/١١٤)
(الفرق بين الفرق : لاپەڕەکانی ٧٢،٧٣)
(مقالات الإسلامين للأشعري: ١/١٦٧)
(مجموع الفتاوى: ٣/٢٧٩)

هەروەها لە بنچینە و أصولی مەزهەبی خەواریجەکان ئەوەیە کەوا: ئیمان لەلایان تەنها یەك شتە، یان ئەوەیە هەمووی لەگەڵتە و دەمێنێت، یانیش هیچی نامێنێت و دەڕوات (هاوشێوەی مورجیئەکان کە ئەوانیش ئیمان لەلایان تەنها یەك شت بوو) هەروەها دەڵێن: ئیمان نە زیاد دەکات و نە کەمیش دەکات، و قورئانیان بە عەقڵی خۆیان تەفسیر دەکرد، تەنانەت دەیانگوت: پێنج نوێژ لەسەر موسڵمانان بوونی نییە بەڵکو تەنها سێ نوێژ هەیە، هەروەها لە بنچینە و أصولی خەواریجەکان: خەڵکیان إمتحان دەکرد و تاقی دەکردەوە بە تەوحید، هەروەکو چۆن ئیمامی بەربەهاری (رەحمەتی الله لێی بێت) لە [شرح السنة] ـدا فەرموویەتی: (إذا قال لك الرجل حدّثني عن التوحيد فهو من الخوارج). واتە: ئەگەر پیاوێك پێتی گوت: دەربارەی تەوحید قسەم بۆ بکە، ئەوا بزانە ئەو کەسە لە خەواریجەکانە.

سەرنجی ووتەکەی ئیمامی بەربەهاری بدە مانای ئەوە دەگەیەنێت کەوا خەواریجەکان موسڵمانان إمتحان و تاقی دەکەنەوە دەربارەی عەقیدەیان، لەبەرئەوەی لەلای خەواریجەکان ئەسڵ لە خەڵکی کوفرە، بە پێچەوانەی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەت.

* ومن زعم أن القرآن مخلوق فهو كافر كفرا ينقل عن الملة، ومن شك في كفره ممن يفهم فهو كافر *

هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات کە قورئان دروستکراوە (مخلوق) ئەوە کافرە کوفرێکە دەری دەکات لە ئیسلام، هەروەها هەرکەس گومانی هەبێت لە کافر بوونی لەو کەسانەی تێدەگەن ئەوە کافرە.

سأل رجل الإمام أحمد بن حنبل ، فقال : يأبا عبدالله ، أصلي خلف من يشرب المسكر ؟ قال : لا . قال : فأصلي خلف من يقول القرآن مخلوق؟ فقال : سبحان الله !أنهاك عن مسلم ، تسألني عن كافر ؟

{طبقات الحنابلة ٢/٣٧٨}

کابرایەك پرسیاری کرد لە ئیمامی احمد (رحمه الله) و پێی گوت: ئەی باوکی عبدالله ئایا نوێژ بکەم لەدوای کەسێکی سەرخۆشەوە ؟ فەرمووی: نەخێر. کابرا گوتی: ئەی لەدوای کەسێکەوە نوێژ بکەم کە بڵێت قورئان مەخلوقە (دروست کراوە) ؟

ئیمامی احمد (رحمه الله) فەرمووی: پاك و بێگەردی بۆ الله من ڕێگریت لێدەکەم لە نوێژکردن لە پشتی موسوڵمانەوە، و تۆش پرسیاری کافرم لێ دەکەیت.

واتە ئەو کەسەی کە باوەڕی وابێ قورئان دروستکراوە کەسێکی کافرە و پێی لە دین دەردەچێت.

عبد الله بْنَ الْمَاجِشُون دەڵێت : هەرکەس بڵێ قورئان دروست کراوە کافرە،
وە دەیگوت گەر مەریسی ببینم دەدەم لە گەردنی.

هَارُون الْفَرْوِيَّ دەڵێت : قورئان وتەی الله یە دروست کراو نییە ، وە هەرکەس بڵێ دروست کراوە کافرە ، وە هەرکەس گومانی هەبێت و بڵێ : ناڵێم دروست کراوە و ناشڵێم دروستکراو نییە ئەویش کافرە.
الرد على من يقول القرآن مخلوق لأبي بكر النجاد.

مُحَمَّد بْنَ مُصْعَبٍ الْعَابِد دەیگوت : یا الله هەرکەس پێی وابێت تۆ قسە ناکەی وە نابینرێی لە قیامەت ئەوا کافر بووە بە ڕوخسارت وە تۆی نەناسیوە ، شاهێدی دەدەم تۆ لەسەر عەرشی لە سەرو حەوت ئاسمانەوە ، وەك ئەوانە نییە کە دوژمنانی الله ئەم مونافیقانە دەیڵێن. عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ الله.
الرد على من يقول القرآن مخلوق لأبي بكر النجاد.

دوژمنانی الله مەبەستی جەهمییەکانە کە دەیان گوت الله لە هەموو جێیەکە کە ئەو بیروباوەڕەش کوفری گەورەیە.

ثَنَا ابو بكر احْمَد بن سلمَان الْفَقِيه النجاد قَالَ ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ حَدَّثَنِي أَبِي رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى قَالَ سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ مَهْدِيٍّ دەیفەرموو : هەرکەس بڵێ : الله قسەی نەکردووە لەگەڵ موسای کوڕی عیمران دا داوای تەوبەی لێ دەکرێت ئەگەر نا لە ملی دەدرێت.

الرد على من يقول القرآن مخلوق لأبي بكر النجاد.

ثَنَا احْمَد قَالَ ثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ احْمَد حَنْبَلٍ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا مَعْمَرٍ الْهُذَلِيَّ دەڵێت : هەرکەس پێی وابێت الله قسە ناکات وە نابیستێ وە نابینێ وە توڕەنابێ وە ڕازی نابێ کۆمەڵێ شتی دیکەی گوت لەو سیفەتانە ، ئەوا ئەو کەسە کافرە بە الله گەر بیان بینم لەسەر بیرێك هەڵیان دەدەمە ناوی ئەمە دینی الله یە ، چونکە ئەوانە کافرن.

الرد على من يقول القرآن مخلوق لأبي بكر النجاد.

**دوو بەڵگەی تر بۆ ئەوەی کە کەلامی الله مەخلوق نییە :**

**بەڵگەی یەکەم :** کە دروستە پەنا بگیرێت بەو وشانەی خۆی دایناوە بۆ گوتنیان و پەنا پێ گرتنیان.

وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: ((أعوذ بكلمات الله تامات من شر ما خلق)) مسلم (٢٧٠٨).
واتە: پەنا دەگرم بە کەلیمە تەواوەکانی الله لە خراپەی دروستکراوەکان.

وە دەفەرمووێ: ((أعوذ بكلمات الله تامة من كل شيطان و هامة و من كل عين لامة)) صحيح البخاري (٣٣٧١).
واتە: پەنا دەگرم بە الله بە کەلیمە تەواوەکانی لە هەموو شەیتانێك کە خاوەنی ژەهرێکی بکوژ بێت وە لە هەموو چاوێك زیان و خراپە بگەیەنێت.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەلامی الله مەخلوق نییە ئەگەر مەخلوق بوایە دروست نەبوو پەنای پێ بگری چونکە پەنا گرتن بە غەیری الله کوفر و شیرکە مرۆڤ لە میللەتی موسڵمانان دەباتە دەرەوە

، پێغەمبەر (صلی علیه وسلم) دەفەرمووێ : ((استعنت فاستعن بالله و اذا استعذت فاستعذ بالله)).

واتە: داوای هاوکاریت کرد داوا لە الله بکە بۆ هاوکاری وە کاتێك پەنات گرت پەنا بە الله بگرە.

جا پەناگرتن بە غەیری الله عیبادەت بۆ کردنی پەنا پێگیراوەکەیە، ئەوەش کوفر و شیرکی گەورەیە ، ئەگەر کەلیماتی الله مخلوق بوونایە استعاذة و پەناگرتن پێیان هەڵگەڕانەوە بوو لە دین بەڵام لە سیفەتی الله ن ، هیچ شتێکیش لە الله مخلوق نییە معاذ الله، هەر بۆیەش سوێند خواردن بە سیفەتەکانی دروستە ، لەبەر ئەوەیە پەنا گرتنیش دروستە بە سیفەتەکانی وەك لەم فەرموودانەدا هاتووە پەنا دەگیرێ بە کەلامی الله جل جلاله.

**بەڵگەی دووەم :**

الله تعالی دەفەرمووێ : (وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (لقمان: ٢٧)

وه دەفەرمووێ : (قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا) (الكهف: ١٠٩)

واتە: ئەگەر هەرچی درەختی زەوی هەیە ببنە پێنووس ، وە دەریا درێژ بکرێتەوە وە حەوت دەریای تریشی لەسەر بێ قسە و فەرمان و وشەکانی الله تەواو نابن و دواییان نایەت. (واتە سیفەتی کەلامی الله دوایی نایەت).

الله عز وجل دەفەرمووێ : (کل شيء هالک الا وجهه)

واتە: هەموو شتێك تیا دەچێ تەنها ڕووی الله نەبێ.

لێرە باسی ذاتی الله دەکات نەك تەنها ڕووی بەڵكو بە هەموو ناو و سیفەتەکانیەوە ، چونکە بەشێکن لە الله ئەوەیش لە زانستی بەلاغەدا پێی دەگوترێ ( ناوهێنانی هەموو بە هەندێك ) یان ( باسکردنی گشت بە ناوی کەمێك ).

هەر وەك چۆن ڕەحمەت و هێز و توانا و زانستی الله لەناو ناچێ ئەزەلی و ئەبەدیە بە هەمان شێوە دەست و پێ و لاق و چاو و ڕوو و ... هتد و کەلامی الله ش لەناو ناچێ بە پێی بەڵگەی ئەو ئایەتانەی سەرەوە.

كعب الأحبار دەڵێ : کاتێك الله قسەی کرد لەگەڵ موسا قسەی لەگەڵ کرد بە هەموو زمانەکان پێش زمانەکەی خۆی ، (موسا لێدوانی دا) دەیگوت : پەروەردگارا والله لەوە حاڵی نابم ، تاوەکو قسەی لەگەڵ کرد لە کۆتایی ئەوەدا بە زمانێك وەکو سەوتی ئەو ، موسا علیه السلام گوتی : پەروەردگار ئەوە کەلامی تۆیە ؟؟ الله فەرمووی : ئەگەر بە کەلامی خۆم قسەت لەگەڵ بکەم ، هیچ نەدەبووی ، یان گوتی (ئامادە) نەبووی بۆی ، (واتە بەرگەت نەدەگرت) ، موسا گوتی: بەڵێ بەدڵنیایی پەروەدگارا وایە ، هیچ لە دروست کراوەکانت لە قسەی تۆ دەچێت ؟ الله جل جلاله فەرمووی : نەخێر ، بەڵام نزیکترین شت لە دروستکراوەکانم کە بچوێ بە قسەی من لە لای خەڵکی بەهێز ترینی دەنگی بروسکەیە (گرمە).

السنة لعبدالله بن أحمد (٥٢٥).

بڕوانە چۆن دەنگی بۆ الله بڕایار دا - وە ئەوەش بەڵگەیە کە کەلامی الله مخلوق نییە کاتێك کەلامی الله ی جیا کردەوە لە مخلوقات.

محمد بن کعب دەڵێ : بەنی اسرائیل گوتیان بە موسا : دەنگی الله بە چی دەچوا کە کاتێك قسەی لەگەڵت کرد ؟ گوتی : بە دەنگی بروسکە کاتێك دەنگ دەداتەوە.

السنة لعبدالله بن أحمد (٥٢٦).

أبو تميلة دەڵێ : پرسیم له نوح بن أبي مريم چۆن الله جل جلاله قسەی لەگەڵ موسا کرد ؟؟ گوتی: (ڕاستەوخۆ به قسەکردن به دەنگ (پێچەوانەی نوسین).

السنة لعبدالله بن أحمد (٥٣١).

ابن تيمية دەڵێ : عبدالله بن أحمد گوتی : گوتم به باوکم لێره کەسانێك هەن دەڵێن : الله به سەوت قسه ناکات، امام أحمد گوتی : کوڕم ئەوانه جەهمییه زەندیقەکانن ، ئەوان لەسەر پەکخستنی (سیفەتەکانی الله دەسوڕێنەوه).

مجموع الفتاوى (١٢ / ٣٦٨).

صالح بن أحمد بن حنبل وه حنبل باس دەکەن که أحمد بن حنبل گوتی : جبريل له الله تعالى ی بیستووه (واته قورئان) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) له جبريلی بیستووه وه هاوەڵانیش له پێغەمبەریان بیستووه (صلى الله عليه وسلم).

السنة للخلال (١٧٧٩).

خلال دەڵێ : أبوبکر المروذي هەواڵی پێداین : بیستم أبو عبدالله (امام أحمد) پێی گوترا : عبدالوهاب (الوراق) قسەی کردووه و گوتوویەتی: هەرکەس گومانی وابێت الله قسەی لەگەڵ موسا کردووه

بەبێ دەنگ ئەوە جەهمییە دوژمنی الله یە و دوژمنی ئیسلامە ، أبو عبدالله بزەیەکی کرد و گوتی : چەند باشی گوتووە ، الله بیپارێزێ.
درء التعارض (٢ / ٣٨ – ٣٩).

## ئەو سیفەتانەی الله عز وجل کە بە عەقڵ و فیترەت جێگیر دەکرێن بۆی پێش قورئان و سوننەت : ( السمع و البصر و الكلام و القدرة و العلو و الارادة و العلم ).

بە عەقڵ و فیترەت دەزانرێ الله عز وجل دەبیستێ و دەبینێ و قسە دەکات و توانای هەموو شتێکی هەیە و لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە هەم زاتی خۆی و هەم توانا و هێزی و هەم پلە و پایەیی و بەبێ ویستی نابێ هیچ شتێك ڕوو بدات و زانستی هەموو شتێکی گرتۆتەوە و هیچ شتێك نییە لە ئاسمانەکان و زەویدا الله نەیزانێ بەڵکو پێش ڕووداوەکان شتەکان دەزانێ بەڵکو پێش ئەوەش بیاننووسێتەوە لە لوح المحفوظدا بەڵکو هەرشتێکیش کە نابێت ئەگەر ببێت دەزانێ چۆن دەبێت و بۆچی دەبێت.

* بیستن ( السمع ) پێچەوانەکەی کەڕییە.
* بینین ( البصر ) پێچەوانەکەی کوێرییە.
* قسەکردن - وتن ( الكلام ) پێچەوانەکەی لاڵییە.

* هێز و توانا ( القدرة ) پێچەوانەکەی لاوازی و پەککەوتەییە.
* بەرز و بڵندی ( العلو ) پێچەوانەکەی نزمیە و دەشێ ( بکەوێتە ژێر و خوار شتێ ترەوە).
* ویست ( المشیئة – الارادة ) پێچەوانەکەی لە ویست دەرچوون و بێ ویستییە ، نەبوونی ( نەبوونی توانای بەڕێوە بردن بە دوای خۆیدا دەهێنێت).
* زانست ( العلم ) پێچەوانەکەی جەهل و نەزانینە.

هەر یەکێك لەم سیفەتانە جێگیر بکرێ بۆ الله پێچەوانەکەی نەفی دەکرێ ، کە وترا الله دەبینێ ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە الله کوێر بێ پەنا بە الله ئەوانی تریش بە هەمان شێوە ، بە هەمان شێوە ئەگەر شتێك لەمانە نەفی بکرێ پێچەوانەکەی جێگیر دەبێ .
بۆیە نەفی کردنی هەر یەکێك لەمانە کوفرە بە الله سبحانە وتعالی پێش اقامة حجة و پێگەیشتنی قورئان و سوننەت چونکە هەر یەکێك لەمانە بۆ مخلوق کەم و کورتیە ئیدی چۆن بۆ الله کەم و کورتی نییە ؟؟.

## بەڵگەکان لەسەر ئەوەی ئەم سیفەتانە بە عەقڵ و فیترەت دەزانرێن:

١ ـ الله عز وجل دەفەرمووێ : ﴿وَمَثَلُ الَّذينَ كَفَروا كَمَثَلِ الَّذي يَنعِقُ بِما لا يَسمَعُ إِلّا دُعاءً وَنِداءً صُمٌّ بُكمٌ عُميٌ فَهُم لا يَعقِلونَ﴾ (البقرة: ١٧١)

واتە: نموونەی ئەو کافرانە وەکو ئاژەڵێك وایە کە تەنها هاوار و بانگەکە دەبیستن کەڕن لاڵن کوێرن ئەوان عەقڵیان نییە (تێناگەن).

ئەمە تەفسیری سەلەفە کە بە (مەڕ و بزن و گوێ درێژ و وشتر ... هتد) وە بەوەش تەفسیری دەکەن کە وەکو بتەکان وایە بەهەمان شێوە ئەمانیش وەك ئەوانن بەڵکو خراپترن.

لێرە نەفی کەڕی و کوێری و لاڵی لە الله دەکرێ و سیفەتی قسەکردن و بیستن و بینین جێگیر دەکرێ ( چونکە باسەکە باسی دەرخستنی ڕووی بەتاڵی کوفری موشریکەکانی قورەیشە و غەیری ئەوانە. لێرەش الله باسی عەقڵی موشریکەکانی قورەیش دەجوڵێنێ کە چۆن هاوار و داوا لە کەسێك دەکەن ئەوە حاڵیانە.

٢ ـ دەفەرمووێ جل جلاله : ﴿إِذ قالَ لِأَبيهِ يا أَبَتِ لِمَ تَعبُدُ ما لا يَسمَعُ وَلا يُبصِرُ وَلا يُغني عَنكَ شَيئًا﴾ (مريم: ٤٢)

واتە : ابراهیم علیە السلام گوتی بە باوکی : بابە گیان بۆ کەسێك دەپەرستی نابیستێت و نابینێ وە هیچ شتێك زیانت لێ ناگێڕێتەوە و سوودت پێ ناگەیەنێت.

لێرەش بینین و بیستن و توانا و ویست جێگیر کراوە بۆ الله چونکە باسی بەراورد کردنی ئەو کەڕو کوێر و لاڵ و لاواز و پەککەوتە و بێ ویستانەیە بەرامبەر الله ی بیسەر و بینەر و بە توانای سوود بەخش و زیان بەخش و خاوەن ویست. بە هەمان شێوە لایەنی عەقڵی تێدایە کە ابراهیم پێغەمبەرە بیر و عەقڵی باوکی دەجولێنێ .

٣ ـ ﴿قال بل فعله كبيرهم هذا فاسألوهم إن كانوا ينطقون﴾ (الأنبياء: ٦٣)

کاتێك ابراهیم علیه السلام بتەکان دەشکێنێ موشریکەکانیش دەڵێن : کێ وای کردووە ... هتد، تاکو ابراهیم دەهێنن لێی دەپرسن : تۆ وات کردووە لە پەرستراوەکانمان ؟ دەفەرمووێ : بەڵکو ئەوە گەورەکەیان وای لێ کردوون لێی بپرسن ئەگەر دێتە گۆ.

لێرەش بۆیە ابراهیم علیه السلام بتەکان دەشکێنێ بۆ ئەوەی خەڵکەکە بیربکەنەوە و بزانن کە ئەمانە ناشتوانن قسە بکەن ئیتر بە کەڵکی پەرستن نایەن بەڵکو الله بە تەنها شایەنی پەرستنە چونکە ئەو قسە دەکات.

٤ ـ لە (٣٥) ئایەتی جیا جیادا بە چەند دەربڕینی جیاواز هاتووە کە الله عز وجل بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا.

( أن الله على كل شيء قدير ، وهو على كل شي قدير ، انك على كل شيء قدير ، والله على كل شي قدير ، و كان الله على كل شيء قديرا ، انه على كل شيء قدير ) ئەمە دەربڕینەکانن.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هێز و توانای الله عز وجل و ڕوونی ئەم سیفەتەی الله کە زۆر دووبارە کردنەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شتەکە زۆر ناسراوە لەلای زۆرینەی خەڵکی و الله بیریان دەخاتەوە .

قورئان کەلامی ( قسەی ) الله جل جلاله بە پیت و دەنگ ( بە حەرف و بە سەوت ).
واتە الله عز وجل قسە دەکات قسەکەی دەبیسترێ و پێکهاتووە لە پیتیش کە وشەی لێ دروست دەبێ ، واتە نوسین و ئاماژە و ... هتد نییە کە زانایانی زانستی النحو باسی دەکەن ( بگەڕێنەوە بۆ پێناسەی الکلام لە لای زانایانی زانستی النحو بابەتەکە ڕوون تر دەبێتەوە ).

**بەڵگە زۆرە بۆ ئەمە کەمێکی باس دەکەین :**

١ - ئەگەر بە دەنگ و پیت قسە نەکات پێی ناگوترێ قسەکردنی ڕاستەقینە هەر وەك پێشتر باسمان کرد کە پەنا بە الله ئەو قسە دەکات و لاڵ نییە ، واتە ئەگەر قسەکردنی الله بە حەرف و سەوت نەبێ

ئەوکاتە ئەو شتانە کە دێت بە نەفسیدا کە پێی دەگوترێ خەتەرەی نەفس ، هەر هی ئەویش نییە دروستی کردووە ، یان ئەوە نەفی ئەوە دەکرێ کە ئەسڵەن کەلامی ئەو نییە و هی جبریلە لە الله ی گێڕاوەتەوە پەنا بە الله ئەمانە کوفرن هەموویان.

٢ ـ ﴿وناديناه من جانب الطور الأيمن وقربناه نجيا﴾ (مريم: ٥٢).
واتە : ئێمە بانگی موسا مان کرد ...

﴿وناديناه أن يا إبراهيم﴾ (الصافات: ١٠٤).
واتە : بانگمان کرد ئەی ابراهیم.

﴿إذ ناداه ربه بالواد المقدس طوى﴾ (النازعات: ١٦).
واتە : یادی ئەوە بکەرەوە کاتێك پەروەردگارت بانگی کرد.
(واتە بانگی موسای کرد ) لە دۆڵی پیرۆزی پێ بکوتە بە زەویدا.

﴿ويوم يناديهم أين شركائي قالوا آذناك ما منا من شهيد﴾ (فصلت: ٤٧).
واتە : ڕۆژی دوایی الله عز وجل بانگیان دەکات (واتە موشریکەکان) کوان هاوبەشەکانم ؟؟ ، دەڵێن : ئێستە زانیمان تۆ کێیت (ناسیمانیت) هیچ یەکێك لە ئێمە گەواهی نادات کە هاوبەشت هەیە تۆ.

﴿ويوم يناديهم فيقول أين شركائي الذين كنتم تزعمون﴾ (القصص: ٧٤)

واته : ئەو ڕۆژەی الله عز وجل بانگیان دەکات ( هاوبەشدانەرەکان ) دەڵێت کوان هاوبەشەکانم ئەوانەی کە ئێوە واتان دەزانی هاوبەشمانن.

﴿فدلاهما بغرور فلما ذاقا الشجرة بدت لهما سوآتهما وطفقا يخصفان عليهما من ورق الجنة وناداهما ربهما ألم أنهكما عن تلكما الشجرة وأقل لكما إن الشيطان لكما عدو مبين﴾ (الأعراف: ٢٢).

﴿قالا ربنا ظلمنا أنفسنا وإن لم تغفر لنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين﴾ (الأعراف :٢٣).

واته : ( ابلیس ) سەری لێ شێواندن ( آدم و حواء ) تووشی لە خۆ بایی بوونی کردن کاتێك تامی درەختەکەیان کرد شەرمگەیان دەرکەوت لە گەڵای بەهەشتیان لە خۆیان پێچا ، پەروەردگاریان بانگی لێ کردن : من ڕێگریم لێ نەکردن لە خواردنی ئەو درەختە وە پێم نەگوتن شەیتان دوژمنێکی ڕوون و ئاشکرای ئێوەیە.

گوتیان : پەروەردگارا ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد ئەگەر تۆ داماننەپۆشیت و لێمان نەبوورت ئێمە لە تیاچوانین.

بڕوانە چەند بە ڕوونی پیشان دەدات الله عز وجل کە قسە دەکات و دەبیسترێ و وەڵام دەدرێتەوە.

النداء : كه سەرچاوەى وشەى نادى و ينادي و ... هتد واته بانگ لێکردن ، بانگ لێ کردنیش به پیت و دەنگ نەبێ ڕوونادات .
واته شتێکی تر نییه بۆ بانگ لێ کردنی کەسێك بەبێ ئەوەی پیت و وشه بەکار بهێنرێ و دەنگیشی تێدا بێت.

٣ ـ ﴿ورسلا قد قصصناهم عليك من قبل ورسلا لم نقصصهم عليك وكلم الله موسى تكليما﴾ (النساء: ١٦٤)
واته : ( ئەی محمد صلى الله عليه وسلم ) ئێمه چیرۆکی کۆمەڵێك له پێغەمبەرانمان ( عليهم الصلاة والسلام ) بۆ گێڕاویتەتەوە که پێش تۆ بوون وه چیرۆکی کۆمەڵێکی تریانمان بۆ نەگێڕاویتەتەوە وه الله عز وجل قسەی لەگەڵ موسا کرد به قسه کردن. (قسه کردنیش ڕوونادات به حەرف و سەوت نەبێ به کۆدەنگی هەموو خاوەن عەقڵەکان).

﴿ولقد أرسلنا رسلا من قبلك منهم من قصصنا عليك ومنهم من لم نقصص عليك وما كان لرسول أن يأتي بآية إلا بإذن الله فإذا جاء أمر الله قضي بالحق وخسر هنالك المبطلون﴾ (غافر: ٧٨)
واته : سوێند بێت چیرۆکی هەندێ له پێغەمبەرانمان بۆ باس کردووی پێش تۆ بوون و چیرۆکی هەندێکی ترمان بۆ باس نەکردووی ...

﴿نحن نقص عليك أحسن القصص بما أوحينا إليك هذا القرآن وإن كنت من قبله لمن الغافلين﴾ (يوسف: ٣)

واته : ئێمە چیرۆكت بۆ دەگێڕینەوە لە باشترینی چیرۆكەكان بەوەی كە ئەو قورئانەمان بۆ تۆ ناردووە ( وەحی مان كردووە بۆت ... ).

﴿إن هذا القرآن يقص على بني إسرائيل أكثر الذي هم فيه يختلفون﴾ (النمل: ٧٦)

بێ گومان ئەم قورئانە چیرۆكی بەنی اسرائیل دەگێڕێتەوە (نەوەكانی پێغەمبەر یعقوب ...).

لێرەش ئەم ئایەتانە باس لەوە دەكەن الله جل جلاله چیرۆك دەگێڕێتەوە، چیرۆك گێڕانەوەش تەنها بە پیت و وشە و بە دەنگە و بەس.

ابن تیمیة دەڵێ : النداء ( بانگ لێ كردن ) لە زمانی عەرەبدا بە مانای دەنگێكی بەرز دێت بەكار نایەت بۆ شتێكی تر جگە لە دەنگ نە لە حەقیقەتدا وە نە لە مەجازیشدا.

ابن القیم دەڵێ : الله سبحانە و تعالی لە نۆ شوێنی قورئاندا هەواڵی لەوە داوە كە خۆی بانگ دەكات وە پێویستە كۆتی بانگ لێ كردن بكرێ بە دەنگ لەبەر ئەوەی ئەوە بەو واتایەیە بە كۆدەنگی زانایانی

زمانەوانی ئەگەر دەنگ لابرا بە دڵنیایی بانگ کردن نامێنێ لەبەر ئەوە ڕوونکردنەوەکەی لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە هاوەڵان و شوێنکەتوانیان و شوێنکەوتوانیان پێیان گەیاندووین وە ئەوانی تریش لە ئوممەت وەریان گرتووە وە کۆت کردنی ( تقييد كردنی ) بە دەنگ بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە و دڵنیاییە ...

٤ ـ ( طه) ، ( الم ) ، ( كهيعص ) ، ( ق ) ، ( ن ) ، ( حم ) ، ( المص ) ... هتد.

گومانی تێدا نییە هەموو ئەمانە پیتن ئەو پیتانەن کە وشەیان لێ پێك دەهێنرێ ، یان دەبێ بڵێین مەخلوقن یان بڵێین لە کەلامی الله ن و مەخلوق نین ، جا هەرکەسێ بڵێ ئەمانە مەخلوقن ئەوا لە گاور و جولەکەکان کافر ترە وەك سەلەف دەڵێن ، یان دەڵێت پیتی الله ن و لەو پیتانەن کە وشەیان لێ پێك دەهێنرێ و مەخلوق نین.

٥ ـ ﴿وأنا اخترتك فاستمع لما يوحى * إنني أنا الله لا إله إلا أنا فاعبدني وأقم الصلاة لذكري﴾ (طه: ١٣-١٤)
واتە : وە من هەڵمبژاردووی گوێبگرە بۆ ئەو وەحیەی بۆت دەکرێ ، منم الله هیچ پەرستراوێك شایەنی پەرستن نییە من نەبێ بمپەرستن و نوێژیش ئەنجام بدەن بۆ یادی من .

ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە کە وتەی الله یە و بە موسای وتووە لەو کاتەی کە قسەی لەگەڵ کرد ڕاستەوخۆ ، هەر کەس بڵێ ئەمە کەلامی الله نییە ئەوە دەبێ ئەوەش جێگیر بکات کە کەسێك یان شتێکی تریش شایەنی پەرستنە بێجگە لە الله هەر وەك جەهمییە زەندیقەکان گوتیان ، چونکە لە ئایەتەکەدا هاتووە کە دەڵێ بمپەرستە جا هەرکەس ئەمە بڵێ هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ موشریکەکانی قورەیش ، لە غەیری الله کێ شایەنی پەرستنە ؟؟؟ حاشا کەس تەنها ئەو نەبێ.

٦ - لەسەر وتەی پەروەردگار کە دەفەرمووێ : ( ولا تنفع الشفاعة عنده إلا لمن أذن له حتى إذا فزع عن قلوبهم قالوا ماذا قال ربكم قالوا الحق وهو العلي الكبير ) (سبأ : ٢٣)
واتە : هیچ تکایەك لەلای ئەو سوودی نییە مەگەر بۆ کەسێك خۆی ڕێی پێدابێت تاوەکو ئەو کاتەی ئەوەی لە دڵی بەندەکانە دەری دەخات ، دەڵێن : الله چی ووت ؟ دەڵێن : حەق و ڕاستی وە هەر ئەویش بەرز و بڵند و گەورەیە.

باسی مردنە ئەم ئایەتە کە پەشیمان بوونەوە سوودی نییە لەو کاتەدا و باسی شەفاعەتە.

ئەمە خۆی لە خۆیدا ڕوونە کە الله جل جلالە قسەی کردووە بەڵام کۆمەڵێك فەرموودە دەهێنین بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە:

أ - پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێ : کاتێك الله جل جلالە ویستی وەحی بکات دەربارەی شتێ قسە دەکات بە وەحی ئاسمانەکان لە تاوا دەهەژێن یان گوتی : دەلەرزن لە ترسی فەرمانی الله کاتێك ئەوانەی لە ئاسمانەکانن ئەوەیان بیست دەحەپەسێن و دەکەونە سوجدە بردن ، یەکەم کەسێك کە سەری بەرز دەکاتەوە جبرائیلە الله عز وجل قسەی لەگەڵ دەکات بە وەحی خۆی بەوەی ویستی لێ بێ ، پاشان جبرائیل تێدەپەڕی بە لای فریشتەکاندا ، هەرکاتێ کە تێدەپەڕێ بە ئاسمانێکدا فریشتەکانی لێی دەپرسن : پەروەردگارمان چی گوت ئەی جبرائیل ؟ دەڵێ : حەق و ڕاستی وە هەر ئەویش بەرز و بڵند و گەورەیە ،
گوتی : دەڵێن : هەموویان ئەوە دەڵێن کە جبرائیل وتی ، جبرائیل وەحیەکەی تەواو دەکات بەو شێوەی الله فەرمانی پێ کردبوو. رواه الطبري في تفسيره.

بڕوانە فەرمووی قسەی کردووە لەگەڵ جبرائیل لە تاو دەنگی الله عز وجل فریشتەکان دەچنە سوجدە. لەم فەرموودانەی تر زیاتر ڕوون دەبێتەوە باسی دەنگی دەکات ...

ب - ابن عباس دەڵێ : الله کاتێك ویستی وەحی بکا بۆ محمد (صلی الله علیه وسلم) جبریل بانگ دەکات کاتێك پەروەردگارمان قسە دەکات بە وەحی دەنگی وەك دەنگی ئاسن وایە لەسەر بەرد ، کاتێك فریشتەکان دەنگی ئاسنەکە دەبیستن دەکەونە سوجدە بردن، کاتێك جبرائیل دێت بۆ لایان بە پەیامەکەوە سەریان بەرز دەکەنەوە دەڵێن: پەروەردگارتان چی گوت : دەڵێن حەق و ڕاستی وە هەر ئەویش بەرز و بڵند و گەورەیە ، وە ئەمە وتەی فریشتەکانە. رواه الطبري في تفسيره.

ت - ابن عباس دەڵێ : کاتێك الله وەحی دەکات بۆ محمد ( صلی الله علیه وسلم ) یەکێك لە پەیامبەرەکان لە فریشتەکان بانگ دەکات بە وەحیەکە دەینێرێ ، فریشتەکان دەنگی جبار دەبیستن قسە دەکات بە وەحیەکە ، کاتێك ئەوەی لە دڵیانە دەردەکەوێ ، دەپرسن دەربارەی ئەوەی الله چی گوتووە ، دەڵێن حەق و ڕاستی وە دەزانن الله هیچ ناڵێت تەنها حەق نەبێ ، وە ئەوەی بەڵێنی پێ داوە دەیکات ، ابن

عباس دەڵێ : دەنگی وەحی وەك دەنگی ئاسن وایە بدرێ لە بەرد کاتێك دەیبیستن دەکەونە سوجدە ... رواه الطبري في تفسيره.

ث - البخاري لە سەحیحەکەیدا دەربارەی وتەی الله جل جلاله : (ولا تنفع الشفاعة عنده إلا لمن أذن له حتى إذا فزع عن قلوبهم قالوا ماذا قال ربكم قالوا الحق وهو العلي الكبير) ، ( گوتی چی گوتووە ) نەیگوت الله چی دروست کردووە ، وە دەفەرمووێ (من ذا الذي يشفع عنده إلا بإذنه) ، مسروق ( قوتابی بەناوبانگی ابن مسعود تابعیەکی گەورەیە ) لە ابن مسعودەوە: کاتێك الله قسەی کرد بە وەحیەکە ئەوانەی لە ئاسمانەکانن شتێك دەبیستن
کاتێك ئەوەی لە دڵیانە دەرکەوت دەزانن ئەوە حەقە وە بانگ دەکەن (پەروەردگارمان چی گوت ؟ دەڵێن حەق و ڕاستی). رواه الطبري في تفسيره.

لێرەش زۆر ڕوونە کە دەنگی الله دەبیستن بەڵام لەبەر ئەوەی شێوە و چۆنیەتی نازانن دەڵێ شتێك دەبیستن ، چونکە ئێمە لە سیفەتەکانی الله جل جلاله دەڵێین هیچ شتێك لە وێنەی سیفەتەکانی الله نییە و ناشزانین سیفەتەکانی چۆنن بۆیە قسە و دەنگی الله سیفەتن و نازانین چۆنن بەڵام دەزانین هەیەتی ، هەواڵی پێ داوین ئەو سیفەتانەی هەیە بۆیە جێگیری دەکەین بەڵام هەواڵی پێ نەداوین چۆنن بۆیە دەڵێین نازانین.

٧ - جابر بن عبدالله دەڵێ : پێم گەیشت کە فەرموودەیەك هەیە نەمبیستووە لە پیاوێکەوە کە لە پێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) بیستوویەتی ، جا وشترێکم کڕی پاشان پێداویستی گەشتەکەم پێچایەوە و کەوتمەڕێ مانگێك ڕێگەم بڕی تاوەکو چوومە شام ، کاتێکم زانی عبدالله بن أنیس بوو ، گوتی (واتە جابر) بە دەرگاوانەکە : پێی بڵێ ( واتە بە عبدالله بن أنیس ): جابر لەبەر دەرگایە ، گوتی : کوڕی عبدالله ؟ گوتم : بەڵێ ، جا هاتە دەرەوە جلو بەرگەکەی ڕێك دەکرد ، لە باوەشی گرتم منیش لە باوەشم گرت ، پێم گوت : پێم گەیشتووە فەرموودەیەکت لە لایە کە لە پێغەمبەرەوە بیستووتە (صلى الله عليه وسلم) ، جا ترسام تۆ بمریت یان من بمرم پێش ئەوەی بیبیستم ، گوتی : بیستم لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : خەڵکی ڕۆژی دوایی کۆ دەکرێنەوە - یان وتی بەندەکان - بە ڕووتی و بە خەتەنە نەکراوی ( سوننەت نەکراوی ) وەکو ئەو کاتەی کە لە دایك بوون ، گوتی ( واتە عبدالله بن أنیس ): گوتمان ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وسلم) ( بهما ) چییە ؟ فەرمووی : هیچ شتێکیان لەگەڵ نییە ، پاشان بانگیان دەکات (واتە الله جل جلاله) بە دەنگێك کەسی دوور دەیبیستێت هەروەك چۆن کەسی نزیك دەیبیستێت : من پادشام من حاکمم و قازیم ( الديان ) بۆ هیچ کەسێکی ئاگری نییە بڕواتە ئاگر ئەگەر مافی بەهەشتیەکی لە لابێت وە

بۆ هیچ بەهەشتیەك نییە بڕواتە بەهەشت ئەگەر مافی کەسێکی ناو ئاگری لە لا بێت تاوەکو تۆڵەی بۆ دەکەمەوە ، هەتتا وەکو زللـەیەکیش ... تا کۆتایی فەرموودە. رواه أحمد برقم ( ١٦٠٤٢ ) ، حسن الاسناد .

لێرەش بە ڕوونی باسی دەنگی الله دەکات جل جلاله کە دەنگیش لە پیت پێك دێت و هیچ مانایەکی تر هەڵناگرێت بە کوێرایی چاوی ئەشعەری و جەهمیەکان.

**چەند سوود و تێبینیەك :**

١ - جێگیر کردنی ناوی الديان واته القاضي و الحاكم.
٢ - گەورەیی فەرموودە و هەوڵی سەلەف بۆ فێربوونی زانست و خزمەتی دینی الله ، کە مشتێك نییە لە خەرمانێك ئەمە دەنکێکە لە خەرمانێ .
٣ - سوننەتی لەباوەش گرتن وەك لەم فەرموودەدا دیار بووە شتێك هاوەڵان بیکەن بۆ ئێمە دینە وەك لە پێشتر باس کراوە .
٤ - هەرکاتێك هاوەڵێك فەرموودەیەکی باس کرد نەیگوت لە رسول الله م بیستووە (صلی الله علیه وسلم) ئەوە دوو حاڵەتی هەیە : یەکەم

یان لەو بابەتانەیە کە مەجالی اجتهاد و فەهمی ئینسان هەڵدەگرێ وەکو بابەتە فەرعیەکان کە ئەمە دەگوترێ اجتهادی هاوەڵەکەیە ، دووەم یان ئەوەتا لەو بابەتانە نییە کە مەجالی اجتهادی تێدا هەیە : ئەوە حوکمی بەرز کردنەوەی هەیە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) واتە ناگوترێ قسەی هاوەڵەکان خۆیانە چونکە ئەوان قسە لە بنەماکانی دین و بابەتە غەیبیەکان ناکەن بەبێ قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

## وتەی زانایانی سەلەف لەسەر جێگیر کردنی کەلامی الله بە حەرف و سەوت وە حوکمی ئەو کەسەی نکۆڵی دەکات:

ابن تیمیة دەڵێ : لە ناو زانایان و سەلەفدا کەسێك نییە بڵێ : الله بە سەوت قسە ناکات ، وە دەربارەی ئەوە کۆمەڵێك ئاثار هاتوون لە سەلەف و زانایانەوە ، وە سەلەف ئەو ئاثارانە باس دەکەن کە باسی قسە کردنی الله ی تێدا هاتووە بە سەوت ، وە هیچ یەکێکیان نکۆڵی لێ ناکەن.

هەروەك ئەوەی زانراوە لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە ( واتە کە کەلامی الله بە حەرف و بە سەووتە ) ، وە ئەوەش وتەی زۆرینەی هەرە زۆری گروپەکانی ئوممەتە چونکە زۆرینەی هەرە زۆری

گروپەکان ( گومڕاکان ) دەڵێن : الله قسە دەکات بە سەوت لەگەڵ جیاوازیان کە ئایا مەخلوقە یان خۆی پێی هەڵدەستێ ؟ کۆنە یان نوێیە؟ ... مجموع الفتاوی (٥٢٧/٦).

وە دەڵێ : ئاثارەکان لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم و هاوەڵان و شوێن کەوتووانیانەوە و دوای ئەوان لە پێشەوایانی ئەهلی سوننە زۆر و بڵاوە : کە ئەو سبحانە وتعالی بانگ دەکات بە سەوت ، بانگی موسای کرد ، وە بانگی بەندەکانی دەکات لە ڕۆژی دواییدا بە سەوت وە کە بە وەحی ش قسە دەکات بە سەوتە ، وە نەگوازراوەتەوە لە هیچ یەکێك لە سەلەفەوە گوتبێتی : الله بە سەوت قسە ناکات یان بە حەرف قسە ناکات ، وە نەشگوازراوەتەوە یەکێکیان نکۆڵی ئەوە بکات الله بە سەوت قسە دەکات یان بە حەرف. الفتاوی (٣٠٤/١٢)

عبدالله بن أحمد بن حنبل دەڵێ : باوکم گوتی : بیستم عبدالرحمن بن مهدي گوتی : هەرکەس گومانی هەبێ لەوەی الله جل جلاله قسەی لەگەڵ موسا کردووە ، داوای تەوبەی لێ دەکرێ وە گەر تەوبەی کرد گەر نا دەکوژرێت.
السنة لعبدالله بن أحمد (٥١٦).

مالك بن أنس دەڵێ : الله قسەی لەگەڵ موسا کردووە.
السنة لعبدالله (٥١٧).

عبدالله بن أحمد بن حنبل دەڵێ : پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی گەلێك دەڵێن کاتێك الله قسەی لەگەڵ موسا کرد بە سەوت قسەی نەکرد ، گوتی : با پەروەردگارت قسەی کرد بە سەوت ، ئەو فەرموودانە بەڕێ دەکەین بەو جۆرەی کە هاتووەن.
السنة لعبدالله (٥١٨).

باوکم گوتی : ئەوانە کافرن دەیانەوێت گومان بۆ خەڵکی پەیدا بکەن ، ئێمە تەنها ئەوە دەگێڕینەوە وەك چۆن هاتوون.
السنة لعبدالله (٥١٨).

عبدالله بن أحمد دەڵێ بیستم أبو معمر الهذلي دەیگوت: هەرکەس وا گومان بکات کە الله قسە ناکات و نابیستێت و نابینێت و تورە نابێت و ڕازی نابێت ، وە شتێکی لەو سیفەتانە باس کرد ، ئەوە کافرە بە الله ئەگەر لەسەر بیرێك بینیتان وەستابوو ئەوە فڕێیدەنە ناوی ، ئەوە دینمە و دینداری پێ دەکەم چونکە ئەوانە کافرن بە الله تعالی.
السنة لعبدالله (٥١٩).

کعب الأحبار دەڵێ : کاتێك الله قسەی کرد لەگەڵ موسا قسەی لەگەڵ کرد بە هەموو زمانەکان پێش زمانەکەی خۆی ، ( موسا لێدوانی دا ) دەیگوت : پەروەردگارا والله لەوە حاڵی نابم ، تاوەکو قسەی لەگەڵ کرد لە کۆتایی ئەوەدا بە زمانێك وەکو سەوتی ئەو ، موسا علیه السلام گوتی : پەروەردگار ئەوە کەلامی تۆیە ؟ الله فەرمووی : ئەگەر بە کەلامی خۆم قسەت لەگەڵ بکەم ، هیچ نەدەبووی ، یان گوتی ( ئامادە ) نەبووی بۆی ، ( واتە بەرگەت نەدەگرت )، موسا گوتی : بەڵێ بەدڵنیایی پەروەدگارا وایە ، هیچ لە دروست کراوەکانت لە قسەی تۆ دەچێت ؟ الله جل جلاله فەرمووی: نەخێر ، بەڵام نزیکترین شت لە دروستکراوەکانم کە بچوێ بە قسەی من لە لای خەڵکی بەهێزترینی دەنگی بروسکەیە (گرمە).

السنة لعبدالله بن أحمد (٥٢٥).

بڕوانە چۆن دەنگی بۆ الله بڕایار دا - وە ئەوەش بەڵگەیە کە کەلامی الله مخلوق نییە کاتێك کەلامی الله ی جیا کردەوە لە مخلوقات.

محمد بن کعب دەڵێ : بەنی اسرائیل گوتیان بە موسا : دەنگی الله بە چی دەچوا کە کاتێك قسەی لەگەڵت کرد ؟ گوتی : بە دەنگی بروسکە کاتێك دەنگ دەداتەوە.

السنة لعبدالله بن أحمد (٥٢٦).

أبو تميلة دەڵێ : پرسيم له نوح بن أبي مريم چۆن الله جل جلاله قسەی لەگەڵ موسا كرد ؟ گوتی: (ڕاستەوخۆ بە قسەكردن بە دەنگ) (پێچەوانەی نوسين).

السنة لعبدالله بن أحمد (٥٣١).

صالح بن أحمد بن حنبل وە حنبل باس دەكەن كە أحمد بن حنبل گوتی : جبريل لە الله تعالى بيستووە ( واتە قورئان ) پێغەمبەريش (صلى الله عليه وسلم) لە جبريلی بيستووە وە هاوەڵانيش لە پێغەمبەريان بيستووە (صلى الله عليه وسلم).

السنة للخلال (١٧٧٩).

ابن تيمية دەڵێ : أبو الحسن محمد بن عبدالملك الكرجي لە كتێبەكەيدا (الفصول في الأصول) دا باسی كردووە دەڵێ : بيستم أبو حامد الاسفرائيني دەيگوت : ڕێبازی من و ڕێبازی الشافعي و فەقيهی شارەكانە : كە قورئان كەلامی الله يە و مخلوق نييە ، وە هەركەس بڵێ مخلوقە كافرە ، وە قورئان جبريل هەڵی گرتووە بە بيستراوی لە الله وە. پێغەمبەريش (صلى الله عليه وسلم) لە جبريلەوە ، وە هاوەڵانيش لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، ئەوەيە كە ئێمە دەيخوێنينەوە بە زمانمان ، وە ئەوەيە لە نێوان ئەو دوو بەرگەيە ، وە لە

سنگماندایە ، بیستراوە و نووسراوە و لەبەرکراوە ، وە هەموو پیتێکی وەکو ( بێ و تێ ) هەمووی کەلامی الله یە و مەخلوق نییە ، وە هەرکەسێ بڵێ مەخلوقە کافرە نەفرەتی الله و هەموو خەڵکی لێ بێ.

الفتاوى (٣٠٦/١٢).

أحمد بن سنان ( شەیخی البخاري ) دەڵێ : هەرکەس وابزانێ قورئان حیکایەی ( کەلامی الله یە - واتە خۆی دەری نەبڕیوە ) ئەوە سوێند بەو الله یەی کە هیچ پەرستراوێك شایەنی پەرستن نییە ئەو نەبێ زەندقێکی کافرە.

اختصاص القرآن لضياء المقدسي (١٦).

اللالكائي دەڵێ : ئەو قورئانە لەسەر حەقیقەتیەتی دەخوێنرێتەوە لە میحرابەکاندا ( شوێن پێشنوێژ ) نووسراوە موصحەفەکاندا ( ئەو پەڕانەی کە قورئانیان تێدا نووسراوەتەوە و کۆ کراونەتەوە و لە نێو دوو بەرگدا دانراون ) ، لە سنگی پیاواندا هەڵگیراوە ، گێڕانەوە و گوزارشت نییە لە قورئان ( بەڵکو قورئان خۆیەتی ) ، وە هەرکەسێ بێجگە لەمە بڵێت کافرێکی گومڕایە.

شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة (٢٧٢).

عبدالوهاب بن عبدالواحد بن الحنبلي دەڵێ : جەهمییەکان نەفرەتی الله یان لێ بێت ، چەند جۆرێکی جیاوازن ... پۆلێك لەوانە دەڵێن: ( ئەو قورئانەی لەبەر دەستمانە ) حیکایەتە لە کەلامی الله.

الرسالة الواضحة (٦٨٤).

أبو محمد عبدالله بن محمد القحطاني لە نونیەکەیدا دەڵێ : هەرکەسێ دەربارەی بڵێ ( واتە: دەربارەی قورئان ) گوزارشتە ( عیبارەت ) یان هاوشێوە ( حیکایەت )ـە لە کەلامی الله - یان لە ( قورئان ) سبەی ئاوی کوڵ بە کوڵیان پێ قووت دەدرێ ( ئاوی تەواو کوڵاو دەکرێ بە گەروویاندا ڕیخۆڵەکانیان دەپسێنێ ).

هارون بن معروف دەڵێ : هەرکەس وابزانێ الله قسە ناکات ئەوە بت دەپەرستێ.

السنة لعبدالله بن أحمد (١٩٥).

محمد بن مصعب دەڵێ : ( یا الله ) هەرکەس وابزانێ تۆ قسە ناکەیت و نابینرێی لە ڕۆژی دوایی دا ئەوە کافرە بە ڕووی تۆ.

السنة لعبدالله (١٩٦).

ابن بطة العكبري دەڵێ : بزانن کۆمەڵێ لە جەهمییەکان گرێیان خستە نێو ئەوەی کە قورئان مەخلوقە بە فێڵی دڵیان و پیسی بیرو بۆچوونیان ناویان لەوە نا بە بیدعەیەك کە دایانهێنابوو ڕواڵەت پۆشیان کرد و شاردیانەوە لە زۆرینە ، بۆ ئەوەی کوفرەکەیان بشارنەوە بۆ ئەوەی بێ دینیەکەیان ئاڵۆز و لێـڵ بکەن لەو کەسەی زانستی کەمە ، ئەو قورئانە الله قسەی پێ کردووە وگوتوویەتی مەخلوق نییە ، وە ئەو قورئانەی دەیخوێنینەوە بە زارمان و دەینووسین لەناو موصحەفەکاندا ئەو قورئانە نییە کە کەلامی الله یە ، ئەوە حیکایەتە لە کەلامی الله.

الابانة الكبرى (٢٢١٤).

السجزي دەڵێ : ئەوەی گوتیان ڕوون بوویەوە ئەو قورئانە کە گوتیان مەخلوق نییە ، گوتیان زمانی عەرەبی نییە سەرەتا و کۆتاییان لێ دەرکرد وە نکۆڵیکەری ئەوەی قورئان عەرەبیە کافرە بە کۆدەنگی وە جێگیرکەری ئەوەشی دەڵێ : قورئان سەرەتا و کۆتایی نییە کافرە.

رسالة الحرف والصوت ل (١٠٧).

ابن القيم دەڵێ : تێ ڕابمێنە لەو برایەتیەی لە نێوان ئەوانە (واتە ئەشعەریەکان) و موعتەزیلەکاندا هەیە ئەوانە کە سەلەف کۆکن لەسەر

تەکفیر کردنیان کە ئەمان زۆر زیاتر لە موعتەزیلەکان ( سیفەتەکانی الله یان ) پەکخست.

صواعق المرسلة (ب ٤ / ل ١٣٨٢).

الهروي ( دەربارەی ئەوەی جیاوازی نییە لە نێوان وتەی جەهمییەکان و ئەشعەریەکان ( دەڵێ : وتیان : واتە جەهمییەکان ) کەلامی نییە ( واتە الله ) بەڵکو کەلامی بۆ خۆی دروست کردووە ، ئەمانیش پێچیان لێ دا و فێڵیان کرد وتیان : ئەوە حیکایەتە کە گوزارشتی لێ دراوە بە قورئان ، الله یەك جار قسەی کرد ئیدی قسە ناکات وە سەوت و حەرفی نییە ( واتە کەلامەکە نەفسیە ) ، بەڵکو ئەوانە بیروباوەڕیان تەنها ئەوەیە کە قورئان بوونی نییە جەهمییە نێرەکان جارێك ئەوەیان گوت ، بەڵام ئەشعەریە مێیەکان دەیان جار گوتیان.

ذم الكلام ل (٦١٠).

**تێبینی:**

**یەکەم:** کۆمەڵێك لەو ئەثەرانە کە باسکراون اسرائیلیاتن ، واتە لە یەهود گێڕدراونەتەوە لەوانە وتەکەی کعب الأحبار (رضي الله عنه) ، بەڵام ئەوە سەلەف قەبوڵیان کردووە کە ئەوان وەریان گرتبێ ئێمەش قسەی لەسەر ناکەین دەڵێین سمعنا وأطعنا ، هەموویان گێڕاویانەتەوە و قسەیان لەسەر نەکردووە ئەوە واتای قەبوڵ کردنی هەیە.

**دووەم:** عبارة و حكاية لە کەلامی الله یان لە قورئان : هەمان واتای هەیە کە قورئان بە حەرف و سەوت نییە و نەفسیە ، واتە قورئان مانای لە الله وەیە بەڵام لفظەکە هی ئەو نییە.

* ومن شك في كلام الله فوقف فيه شاكا، يقول : لا أدري مخلوق أم غير مخلوق فهو جهمي، ومن وقف في القرآن جاهلا علم وبدع ولم يكفر. ومن قال : لفظي بالقرآن مخلوق، أو القرآن بلفظي مخلوق فهو جهمي *

هەرکەس گومانی هەبێت لە ووتەی الله، و بوەستێت تێیدا بە گومانەوە، بڵێت : نازانم دروستکراوە (مخلوق) یان دروستکراو (مخلوق) نییە ئەوە جەهمییە، هەروەها ئەوەی بوەستێت لە قورئاندا بە نەزانین، ئەوە فێردەکرێت و تەبدیع دەکرێت بەڵام تەکفیر ناکرێت. هەروەها هەرکەس بڵێت ووتەی من بە قورئان مخلوقە، یان قورئان بە دەربڕینی من مخلوقە، ئەوە جەهمییە.

سفيان بن عيينة دەڵێ : هەرکەس نەڵێ قورئان کەلامی الله یە وە الله لە بەهەشتدا دەبینرێ ئەوە جەهمییە.

شرح أصول اعتقاد للالكائي (٨٧٦).

عبدالله بن أحمد بن حنبل دەڵێ : باوکم گوتی : فەرموودەی ابن مسعود کە: کاتێك الله قسەی کرد سەوتێکی لێ بیسترا وەکو ڕاکێشانی زنجیر وابوو لەسەر بەردێکی ساف ، باوکم گوتی : ئەوە جەهمییەکان نکۆڵی لێ دەکەن.

السنة لعبدالله (٥١٨).

ابن تيمية دەڵێ : عبدالله بن أحمد گوتی : گوتم بە باوكم لێرە كەسانێك هەن دەڵێن : الله بە سەوت قسە ناكات ، امام أحمد گوتی : كوڕم ئەوانە جەهمییە زەندیقەكانن ، ئەوان لەسەر پەكخستنی (سیفەتەكانی الله دەسوڕێنەوە).

مجموع الفتاوى (١٢ / ٣٦٨).

خلال دەڵێ : أبوبكر المروذي هەواڵی پێداین : بیستم أبو عبدالله (امام أحمد) پێی گوترا : عبدالوهاب ( الوراق ) قسەی كردووە و گوتوویەتی : هەركەس گومانی وابێت الله قسەی لەگەڵ موسا كردووە بەبێ دەنگ ئەوە جەهمییە دوژمنی الله یە و دوژمنی ئیسلامە ، أبو عبدالله بزەیەكی كرد و گوتی : چەند باشی گوتووە ، الله بیپارێزێ.

درء التعارض (٢ / ٣٨ – ٣٩).

**أبو حاتم الرازي و بابەتی لەفز:**

قوام السنة الأصبهاني (٥٣٥ هـ) دەڵێ : أَخْبَرَنَا أحمد بن عبد الْغفار بْن أشتة، أَخبرنا أَبُو بكر بْن أَبِي نصر، حدثنَا أَبُو الشَّيْخ ، حدثنَا إِبْرَاهِيم بْن مُحَمَّد بْن الْحسن، نَا مُحَمَّد بْن مَسْعُود الطوسوسي قَالَ : سَمِعت الْحسن ابْن الصَّباح الْبَزَّار قَالَ :سَمِعت أَحْمَد بْن حَنْبَل يَقُول :افْتَرَقت الْجَهْمِية عَلَى ثَلَاث فرق قَالَت : بالخالق،

وَفرْقَة قَالَت : بالمخلوق، وَفرْقَة قَالَت : لفظنا بِالْقُرْآنِ مَخْلُوق، وشرها من قَالَ :لَفْظِي بِالْقُرْآنِ مَخْلُوق.

قَالَ : وَحَدَّثَنَا أَبُو الشَّيْخ، حدثنَا أَحْمَد بْن عَليّ بْن الْجَارُود قَالَ : سَمِعت أَبَا حَاتِم وَقيل لَهُ : إِن قوما يَقُولُونَ اللَّفْظ غير الملفوظ، وَالْقِرَاءَة غير المقروء، فَقَالَ : أُولَئِكَ الْجَهْمِية، اللَّفْظ والملفوظ، وَالْقِرَاءَة والمقروء وَاحِد، وَهُوَ غير مَخْلُوق.

الحجة في بيان المحجة : (٣١٣/١)

احمد بن علي بن الجارود دەڵێ : بیستم بە ابو حاتم گوترا : کەسانێك دەڵێن :لەفز و مەلفوز جیان، قیرائە و مەقروء جیان. ابو حاتم گوتی : ئەمانە جەهمین، لەفز و مەلفوز، قیرائە و مەقروء یەك شتن، وە غیر مەخلوقە.

ریوایەتی یەکەمم بۆیە هێناوە تاکو سەنەدەکە ببینن چونکە ریوایەتی دووەم هەمان سەنەدە لەنێوان مصنِف و ابو الشیخ، کە دەڵێ : قال وحدثنا أبو الشيخ، واتا سەنەدی دووەم بەم جۆرەیە : قال قوام السنة الأصبهاني : اخبرنا احمد بن عبد الغفار بن اشتة، قال اخبرنا ابو بكر بن ابي نصر، قال حدثنا ابو الشيخ، حدثنا احمد بن علي بن الجارود، قال سمعت أبا حاتم ... وە سەنەدەکەش سەحیحە.

هەروەها ابن تيمية (٧٢٨ هـ) لەم سێ شوێنەدا گوتنی (لفظي بالقرآن غير مخلوق) داوەتە پاڵ أبو حاتم الرازي (٢٧٧ هـ).

مجموع الفتاوى : (١٢/٢٠٧). مجموع الفتاوى (١٢/٣٦١). مجموعة الرسائل والمسائل: (٣/١٢٨).

وە لە شوێنێكدا ئەمەی داوەتە پاڵ أبو زرعة الرازي (٢٦٤ هـ) محمد بن يحيى الذهلي (٢٥٨ هـ)

بەڵام جەزمی نەكردووە بە صیغەی تمريض هێناويەتی واتا لێی دڵنیا نییە، هەروەها دەربارەی ابو زرعة دەڵێ هەندێك لە خەڵكی ئەمەیان داوەتە پاڵی، بەڵام بۆ ابو حاتم الرازي لە شوێنێك جەزم دەكات كە گوتوويەتی (لفظي بالقرآن غير مخلوق).

وە هەر عوزرێك بۆ البخاري (٢٥٦ هـ) بهێندرێتەوە لە تێوەگلان لە بابەتی (لەفز) ئەوا ابو حاتم الرازي ئەولاترە عوزری بۆ بهێندرێتەوە، چونكە تەنانەت ابو طالب كە قوتابی ئیمام احمد بووە كە دەبیستێ ئیمام احمد دەڵێ ئەوەی بڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوقە جەهمییە، وا تێدەگات كە ئیمام احمد دەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوق نییە، واتا مادام ئینكاری یەكەمیان بكات ئەوا لەسەر ئەوەی دووەمە، ئینجا نامەی بۆ خەڵكی ناوچەیەك نارد پێی گوتن كە احمد دەڵێ لەفزم بە قورئان مەخلوق نییە، ئەمەی بە لێكدانەوە و تێگەیشتنی خۆی نووسی بوو نەك

له زاری ئیمام احمد ئەمە ببیستێ، کە ئیمام احمد ئەمەی زانی زۆر لێی توڕە بوو پێی گوت کە خەڵك ئاگادار بکاتەوە لەمە، وە پێی گوت هیچ زانایەك ئەمەی نەگوتووە، نابێ بڵێین لەفزمان بە قورئان غیر مەخلوقە هەروەك چۆن نابێ بگوترێ لەفزمان بە قورئان مەخلوقە، بەڵکو دەگوترێ قورئان لە هەموو حاڵێکدا کەلامی الله یە و مەخلوق نییە، واتا باسی لەفز ناکرێ.

ئینجا ابو طالب خەڵکی ئاگادار کردەوە لەم هەڵەیە، بەڵام بەشێك لە ئەتباعەکانی ئیمام احمد لە خوراسان ئەمە قبوڵ ناکەن ئەم بەسەرهاتە بە درۆ دەزانن یان دەڵێن ئیمام احمد پەشیمان بۆتەوە لەم وتەیەی پێی وابووە لەفزمان بە قورئان غیر مەخلوقە، بۆیە ئەوانیش وا دەڵێن، بەڵام ئەوەی ئەمە دەگێڕێتەوە کەسە نزیکەکانی ئیمام احمدن وەك عبدالله و صالح و المروذي، تەنانەت المروذي کتێبی نوسیوە بۆ ڕەددانەوەی ئەوانەی کە دەڵێن لەفزمان بە قورئان غیر مەخلوقە، هەروەها کە صالح کوڕی ئیمام احمد دەبێتە قازی لە سەنگەرەکان المروذي پێی دەڵێ بەسەرهاتی ابو طالب باس بکە بۆ خەڵکی.

ئەوەی ئیمام احمد و پێشەوایانی سەلەفی لەسەر بووە ئەوەیە کە ئەوانەی دەڵێن (لەفزمان بە قورئان مەخلوقە) جەهمین.

وە ئەوانەی کە دەڵێن (لەفزمان بە قورئان غیر مخلوقە) بیدعەچین.

جا ئێمەش دەڵێین لای ئێمەی ئەهلی سوننە قورئان هەموو کات کەلامی الله یە، لەناو دڵمان و بە گوتن و دەربڕینمان و خوێندنەوە و ... هتد ، هەموو کات هەر کەلامی الله یە و هیچ کاتێك مەخلوق نییە.

*** قال أبو محمد : سمعت أبي يقول : علامة أهل البدع :الوقيعة في أهل الأثر ***

أبو محمد فەرموویەتی : گوێم لە باوکم بوو دەیگوت : نیشانەی أهلی بیدەع ئەوەیە : أهلی ئەثەر (حديث) لەکەدار دەکەن.

هەروەکو چۆن دەبینین خەواریجەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن مورجیئە، و مورجیئەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن خەواریج، هەروەها معطیلەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن مشبهە، و مشبهەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن معطیلە، هەروەها قەدەرییەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن جەبەری، و جەبەرییەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن قەدەری ... هتد، بەڵام ئەمانە هەموویان ئەهلی سوننە لەکەدار دەکەن و ئەهلی سوننە دوورە لە هەموو ئەم تاقمە گومڕایانە و لە هەموو حاڵەتەکان ئەهلی سوننە لە وەسەت و ناوەڕاستدایە و لەسەر ڕێگای ڕاستن.

## * وعلامة الزنادقة : تسميتهم أهل الأثر حشوية، يريدون إبطال الآثار *

هەروەها نیشانەی زندیقەکان ئەوەیە : أهلی ئەثەر (حدیث) ناو دەنێن حشوية، دەیانەوێت ئەثەرەکان هەڵبوەشێننەوە.

**حەشەویە :** تاقمە گومڕاکان و ئەهلی بیدعە بە ئەهلی سوننە و فەرموودە دەڵێن حەشەوی، تۆمەتباریان دەکەن کە ئەوان بێکەڵکن لەناو خەڵکی و بێسوودن، و وتەکانیان بێ سوودە.

**ئیبن قوتەیبە** لە (تأویل مختلف الحدیث) دەڵێت : ئەهلی بیدعە بە ئەهلی حەدیثیان دەگوت حەشەوی.

## * وعلامة الجهمية : تسميتهم أهل السنة مشبهة. *

هەروەها نیشانەی جەهمییەکان ئەوەیە : أهلی سوننە ناو دەنێن مشبهة.

**مشبهة** : لێکچوێنەرەکان ــ موشەبیهەکان ئەوانەن کە سیفاتەکانی الله تعالی دەچوێنن بە سیفاتی درووستکراوەکانی، دەڵێن: الله بیستنی وەك بیستنی مرۆڤەکانە، جا لە سەرووی ئەم موشەبیهانەوەش: (الحکمي) حەکەمیـیـەکانن کە هاوەڵانی هیشامی کوڕی حەکەم ـی ڕافیزی ـن، باوەڕیان وایە کە الله سبحانە وتعالی، خاوەنی جەستەیەکە کەوا حەد و نیهایەتی هەیە، پان و درێژە، درێژیەکەی هاوشێوەی پانیەکەیە (پاك و بێگەردی بۆ الله تعالی لەوەی ئەو موشریکانە بانگەشەی بۆ دەکەن) جگە لەمانەش زۆریتر هەنە، کە زانایان و پێشەوایانی ئەهلی سوننە وەڵامی ئەمانەیان داوەتەوە و بەرپەرچیان داونەتەوە و ئینکاریان کردووە لەم قسانەیان، بەڵکو زۆرێکیان تەکفیری ئەمانەیان کردووە، هەروەها ئیعتباریان بۆ کردوون بە زێدەڕەوە دەرچووەکان لە ئیسلام (سبحان الله عما یصفون).

جەهمیەکان بە ئەهلی سوننە دەڵێن مشبهة ، واتا تەشبیهی الله دەکەن بە مەخلوقات ، مەبەستیشیان لەمە ئەوەیە کە هەر کەسێك سیفەتەکانی الله

به زاهیری وەربگرێت ئەوا ئەم کەسە الله ـی تەشبیهـ کردووە بە مەخلوقات بۆیە پێی دەڵێن مشبهة .

البخاري رحمه الله دەفەرموویێت: هەر کەسێك بە ئەهلی سوننەی ووت مشبهة دەزانین جەهمییە .

حرب الكرماني رحمه الله دەفەرموویێت: جەهمیەکان ناویان لە ئەهلی سوننە ناوە مشبهة .

ووتم: ابن حجر ـیش لە (فتح الباري) درێغی نەکردووە لە ناو بردنی ئەهلی سوننە بە مشبهة و مجسمة !
ڕەنگە بڵێن زۆرجار دەڵێت ئەهلی سوننە !
هەموو ئەشعەرییەك کە دەڵێ ئەهلی سوننە ئەوا مەبەستی خۆیانە ، خۆیان بە ئەهلی سوننە دەزانن ، ئەگینا ئەهلی سوننەی ڕاستەقینە بە مشبهة و مجسمة ناو دەبەن ، ئەمەیان لە برا گەورەکەیان بۆ ماوەتەوە واتا لە جەهمیەکان .

## * وعلامة القدرية : تسميتهم أهل السنة : الجبرية. *

هەروەها نیشانەی قەدەرییەکان ئەوەیە : أهلی سوننە ناو دەنێن الجبرية.

**الجبرية :** جەبەریەکان پێیان وایە بەندە لە لایەن الله تعالى جەبریان (زۆریان) لێ کراوە کە گوناح بکەن، واتا: بە هیچ گوناحێك تاوانبار نابێت.

## * وعلامة المرجئة : تسميتهم أهل السنة : مخالفة ونقصانية. *

هەروەها نیشانەی مورجیئەکان ئەوەیە : أهلی سوننە ناو دەنێن پێچەوانە و کەموکوڕ.

## * وعلامة الرافضة : تسميتهم أهل السنة : نابتة و ناصبة. *

هەروەها نیشانەی ڕافیزەکان ئەوەیە : أهلی سوننە ناو دەنێن نابتة و ناصبة.

## * ولا يلحق أهل السنة إلا إسم واحد ويستحيل أن تجمعهم هذه الأسامي *

هیچ ناوێك نالكێندرێت بە أهلی سوننەوە ئیللا یەك ناو نەبێت ئەویش (ئەهلی سوننەیە)، و هەرگیز ئەم كۆمەڵە ناوانە لەخۆ ناگرێت.

## * قال أبو محمد : سمعت أبي وأبا زرعة يأمران بهجران أهل الزيـغ والبدع، ويغلظان رأيهما أشد التغليظ، وينكران وضع الكتب بالرأي في غير آثار *

أبو محمد فەرموویەتی : گوێم لە باوكم و أبو زرعة بوو ئەمریان دەكرد بە دووركەوتنەوە و هەجر كردنی أهلی زیغ و بیدعە، هەروەها ڕقیان لە بۆچوونەكانیان بوو بە توندترین ڕق لێبوونەوە، و ڕێگربوون لە دانان و نووسینی كتێب بە بیروبۆچوونی خۆت بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەثەر.

**مامەڵەكردنی سەلەف لەگەڵ ئەهلی بیدەع:**

إسحاق بن منصور دەڵێ : گوتم : بڕینی پەیوەندی جێگیر بووە لەلایەن رسول الله وە (صلى الله عليه وسلم) ؟

ئەحمەد فەرمووی : بەڵێ.

إسحاق فەرمووی: زۆریش توند بووە.
"مسائل الكوسج"

ابن هانئ دەڵێ : پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله ئیمام ئەحمەد ، دەربارەی پیاوێکی موبتەدیع ، بانگخوازی دەکات بۆ بیدعە ، ئایا دانیشین لەگەڵی ؟ ئەحمەد فەرمووی : نەخێر قسەشی لەگەڵ ناکەی ، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە.
"مسائل ابن هانئ "

خلال دەڵێت : هەواڵی پێدام عبيد الله بن حنبل گوتی : پێی گوتين أبي حنبل بن إسحاق گوتی : بۆی گێڕامەوە أبو عبد الله گوتی : بۆی گێڕامەوە ثنا أبو سلمة گوتی : وە بۆی گێڕاينەوە أبو بكر بن أبي شيبة، گوتی : بۆی گێڕامەوە ابن علية، لە أيوب، لە أبي قلابة گوتی : دامەنیشن لەگەڵ ئەهلی هەواو یان گوتی ئەهلی جیدال و مناقەشە ، من ئەمین نیم لەوەی تێوە بگلێن و گومڕایی ئەوان لە دڵ و فیکرتان جێگیر بێ ، ئێوەش وەك ئەوان گومڕا بن لەوەی دەیزانن.
"السنة للخلال" (٢ /٢٨٨) (١٩٦٨).

أبو بكر المروذي دەڵێ : گەشت بە ئیمام ئەحمەد هاتنی پیاوێکی موبتەدیع ، ئینکاری کرد لە دانیشتن لەگەڵی و ئاشنابون پێی ، وە فەرمووی : تاوەکو تەوبە و پەشیمانی لێ دەبینرێ.

ریوایەت کرا لە المروذي گوتویەتی : یەحیای کوڕی مەعین هات بۆ لای ئیمام ئەحمەد ، سەردانی کرد ، ئیمام ئەحمەد ڕووی لێ وەرگێڕا و قسەی لەگەڵ نەکرد ، بەردەوام توند بوو لەگەڵی قسەی لەگەڵ نەدەکرد.

مروذي دەڵێ : هەواڵیان پێداین کە باوکی عبدالله واتە ئیمام ئەحمەد باسی حارثی المحاسبي کردووە ؛ فەرموویەتی : حارث بنچینەی بەڵاکەیە - واتە قسەکانی جەهم - هیچ موسیبەتێك نییە جگە لە حارث هەموو ئەوانەی هاوەڵایەتیان کرد ئاگادارکران جگە لە ابن العلاف، ئەو مرد و حاڵی شاراوەبوو ، ئاگاتان لە حارث بێت زۆر هۆشیار بن.

گوتم : کۆمەڵێك جیاوازن دەربارەی و وا نابینن خراپ بێت ؟

گوتی : بیدعەکانی ئەویان پێ نیشان دەدەین و دەیخەینە بەردەمیان ڕەنگە ئاگاداری بیدعەکانی نەبن.

گەر قەبوڵیان کرد باشە گەر نا ئەوانیش هەجر دەکرێن ، حارث تەوبەی نەکرد ، شاهێد بوون لەسەری و ئاگاداریان کرد بەڵام ئینکاری دەکرد ، تەوبە بۆ کەسێکە ئیعتراف بکات.

طبقات الحنابلة (١ /١٥٠).

عبد الله گوتی : باوکم بۆی گێڕاینەوە گوتی : گۆڕی ئەهلی سوننە لەوانەی تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە باخاتە، گۆڕی ئەهلی بیدعە لەوانەی تاوانیان نەبووە و زۆر عیبادەت بوون دۆڵێکە لە ئاگر، تاوانباران و تاوان کارانی ئەهلی سوننە ئەولیای الله ن ، عیبادەت کاران و خواناسانی ئەهلی بیدعە دوژمنی الله ن.

عبد الله بن محمد بن الفضل الصيداوي گوتی : ئیمام ئەحمەد پێی گوتم : ئەگەر مسوڵمانێك سەلامی کرد لە موبتەدیعێك ئەوا خۆشی ویستووە ، چونكە رسول الله فەرمووی : ئاگادارتان کەم لە کارێك گەر ئەنجامی بدەن یەکترتان خۆشبوێت ؟ سڵاو بكەن لە یەکتری و بڵاوی کەنەوە لە نێوان خۆتان.
"طبقات الحنابلة" (٢ /٤٧) ، "الآداب الشرعية" (١ /٢٥١).

عثمان بن إسماعيل بن بكر السكري گوتی : گوێم لێبوو لە أبو داود السجستاني دەیگوت : گوتم بە ئیمام ئەحمەد : پیاوێك دەبینم لە ئەهلی سوننە لەگەڵ ئەهلی بیدەع ، ئایا قسەی لەگەڵ داببڕم ؟
فەرمووی : نەخێر : پێی بڵێ ئەوەی لەگەڵی قسە دەکەی ئەهلی بیدەعە ، واتە ئاگاداری بكەوە لێی ، ئەگەر قسە کردنی لەگەڵی تەرك کرد باشە گەر نا تەرکی بكە. ابن مسعود دەیفەرموو : هەرکەس بەپێی هاوڕێکەی هەڵدەسەنگێنرێت.
"طبقات الحنابلة" (١ /٤٢٩).

إِسْمَاعِيلُ بْنُ سَعْدٍ الْبَصْرِيُّ ، پیاوێك پێی گوت: ڕۆژێك لەگەڵ عەمری کوڕی عوبەید دەڕۆشتم ، ابن عون بینیمی دوو مانگ قسەی لەگەڵ نەکردم.
البدع لإبن وضاح.

* وينهيان عن مجالسة أهل الكلام وعن النظر في كتب المتكلمين، ويقولان: لا يفلح صاحب الكلام أبدا *

هەروەها ڕێگریان دەکرد لە دانیشتن لەگەڵ أهلی کلام و لە سەیر کردنی کتێبەکانی أهلی کلام، و دەیانگوت : هەرگیز سەرفراز و سەرکەوتوو نابن أهلی کلام و هاوەڵانی کلام.

**ئەهلی کلام :** تاقمێکی فەلسەفین، دەڵێن: ئیمان بریتییە لە تەسدیقی زمان، نەك دڵ و کردەوە، ئەقڵی خۆیان دەخەنە پێش نەقڵ و دەقەوە، کۆمەڵێکی عەقڵانین عەقڵ تەقدیس دەکەن ئەگەر ئایەتێك یان فەرموودە نەچێتە عەقڵیانەوە وەری ناگرن .!

